رەنج سەنگاوی

# مەهێڵە کاڵ بیتەوە

چاپی چوارەم
سلێمانی ٢٠٠٧

ناوی کتێب : مەهێڵە کاڵ بیتەوە

بابەت : شیعر

نوسینی : رەنج سەنگاوی

کاری کۆمپیوتەری : هێدی محەمەد

مۆتیف : هێمن کاکەیی

مۆنتیقی بەرگ : محەمەد فەتاح

دیزاینی بەرگ : بازیان جەلال

تیراژ : ( ۸۰۰ ) دانە

چابخانەی ( هێرۆ )

ژمارەی سپاردنی ای ساڵی ۲۰۰۵ ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ

سەرنج :

من بەهەستێکی زۆر منداڵانەوە ئەم دێڕانەم نوسیوە ، گرنگ نییە بەلامەوە ناوی ئەنێن شیعر یان نا ، گرنگ ئەوەیە خۆم بڕوام ئەمانە شتێک نین لە دەرەوەی ئەدەب.
تێکستەکانم تەواو زاتین ، بەڵام ئەمە بۆ من کەموکورتی وعەیبە نییە ، چونکە باوەڕم وایە هەر نوسەرێ نەتوانێ خۆی بنوسێتەوە مەحاڵە بتوانێ ئەویتر بخوێنێتەوە.

رەنج سەنگاوی

پایزی ٢٠٠٤

## ساندی بێل

هەر ئەوەندەم ئاگا لێیە
لەپاش پێنجەمین خولەکی وانەکەمان
ئیتر من ئەبم بە خەیاڵ
لەپەنجەرەی شەشەم قاتی کۆلێژەوە
ئەڕۆم ئەدەم لە شەقەی باڵ
خوێندکارەکان من نابینن
کەمێک لەسەر درەختێکی کانی عاشقان ئەنیشمەوە و
گوێ لە لەچرپە و ڕاز ونیازی جوتێ خەمی شەیدا ئەگرم
ئارام ناگرم هەڵئەفڕم
ئەکەومە دوای شەیدایی دڵی پڕم

دێم بۆ ماڵتان ...

دەرگاو پەنجەرەی ماڵەکە داخراوە و

تەنانەت (با) ش ڕانابووریٚ

هەر منی مەست . هەر منی خەیاڵ ئەتوانم بێمە ژووریٚ

دێمە ژووریٚ و ژوور بەژووری ماڵەکەتان ئەپشکنم

جار جار مەستی بەرمئەدا و ئەڵێم خوایە لەکویٚ ونم ؟

لەناکاوا وێنەیەکی منالی تۆ ئەبینم وبە چاوانتا ئەتناسمەوە

گەرد وتۆزی سەر شوشەکەی ئەسڕمەوە بە لەپی دەست

لەو کاتەدا ئەبیٚ چۆن بیٚ سۆز و تاسەی دڵێکی مەست

لەپاش ئەوە بەرەو ژوورێکی تر ئەفڕم

پڕ لە ڕەنگ و لەبۆنی خۆش

حەز ئەکەم لەوێدا بمرم

چونکە پڕە لە ژیان و پڕ لە عەشق و ڕنگ و بۆیە

زوو چاوم ئەیناسێتەوە ژوری تۆیە

دێمە بەردەم کەنتۆرەکەت

پێم ناخۆشە بیکەمەوە بێ پرسی خۆت

بەڵام چیبکەم من وا هاتووم بگەڕێم بۆت

کەنتۆرەکەت ئەکەمەوەو دەستە دەستە جلەکانت

دەرئەهێنم

دەست ئەدەمە کڵاوە شەرابیەکەت

لەسەر ڕانم ئەیخەوێنم

لە پاش ئەوە دەست ئەبەم بۆ دەفتەری یاداشتەکانت و

هەرچەند ئەکەم دڵم نایە پەڕەکانی هەڵبەمەوە

پێم ناخۆشە بێ پرسی خۆت دەرگای نهێنیە کانت بکەمەوە

ئەمجارەیان زریزەکەت دەرئەهێنم

زۆر حەز ئەکەم بیدزم وبیکەمە گەردنی شیعری

ئەویشیان دائەنێمەوە

گومان ئەکەم شتێ دزیم لێ وەربگرێ

لە باوەشماو لە تەنیشتی دوو دەستکێشە بچکۆلەکا
کلاّوەکەت هەر نوستووە وهەست بەدڵنیایی ئەکا
بۆی ئەڕوانم لە پاش کەمێ
زۆر هێواش دەستی ئەدەمێ
بە سۆزەوە بۆ چەند جارێ ماچی ئەکەم
دایئەنێم ودەرگای کەنتۆر پێوەئەدەم
لە پاش ئەوە ئەڕۆم بۆ لای کتێبخانە خنجیلەکەت
یەکەم کتێب چیرۆکەکەی گوڵی ڕەشە
ئەویان ئەبەم بۆ سەر چرپا نازدارەکەت
سەر ئەخەمە سەر سەرینە بۆنخۆشەکەت
نمەنمە ئەیخوێنمەوە
عەشقی حەمەی پاڵەوانی تک تک ئەتکێتە خوێنمەوە

لەو کاتەدا گوێم لەترپەی پێ یەکەدێ و هیچ ناترسم
خێرا بەڵێن بە خۆم ئەدەم
هەر کەسێ بێ هەواڵی تۆی لێ ئەپرسم
دەسکی دەرگاکە ئەجوڵێ و دەرئەکەوێت
هەست ئەکەم دنیا تاریکە وتۆ تریفەی مانگە شەوێت
چیرۆکەکە دائەنێم و بۆت ئەڕوانم
ئەمەوێ لەگەڵت بدوێم
هەرچەندە ئەکەم ناتوانم

دێیتە ژووریٚ....

دەفتەرەکانت دائەنێی لەبەردەم ئاوێنەکەتا

خێرا دێم وچەند دێرێکت بۆ ئەنوسم

ئەڕۆمەوە سەر چرپاکە وبە پۆیەشمینە خاوەکەت

تا سەر شانم ، هەموو باڵم دائەپۆشم

دڵم پڕ ئەبێ لە ژیان

یەکەمجارە خۆم ئەبینم هێندە حەیران ودڵخۆشم

لەو ساتەدا کەمێ چاوم لەسەر باڵات لائەچێت و

سەرنجم ئەچیٚ بۆ چاوی ئەو تابلۆیەی

بەسیمێکی سپی باریک بە دیواری ژوورەکا هەڵتواسیوە

هەر لەناو نوێنەکانت دام

وا هەست ئەکەم قوماتەم و تازە ژیانم ناسیوە

لەپاش ئەوە خۆت ئەگۆڕیت
کراسەکەت لائەبەیت و
بۆ یەکەم جار پێیئەزانم لەسەر سنگت
پۆلێ نیشانەی ورد هەیە
چاوم ڕەشکەوپێشکە ئەکا و
هەست ئەکەم حەوتەوانەیە
ئەو شەوانەم دێنەوە یاد
بەمناڵی لەسەربانی ماڵەکەمان دایکم جێی بۆ ڕائەخستم
ئەمڕوانیە حەوتەوانە و هەتا درەنگ نەئەنوستم
حەوتەوانە پۆلێ دۆستی ئێجگار لە مێژینەی منن
زۆر دەمێ بوو نەمبینیبوون
ئەمڕۆ زانیم لە کوێ ونن

بۆدیەکی تر هەڵئەگری و
هەر بە ڕوتی لەبەردەم ئاوێنەکەتا
هەردوولا شانی ئەگریت وئەینێی بەسنگی خۆتەوە
هێشتا ئەمڕۆت زۆری ماوەو خەیاڵت لای سبەینێ یە
ئەوەی ئەتەوێ بتبێنی بەو بۆدیە کاڵەتەوە
ئاخۆ کێ یە !...
من هەر لەسەر چرپاکەم و بۆت ئەڕوانم
چیرۆکەکەی گوڵی ڕەشم داناوە لەبن باڵم دا
لەو کاتەدا خەیاڵێکی تر ئەپشکوێ
لەئینجانەی خەیاڵمدا

بیر ئەکەمەوە پێت بڵێم بۆ سبەینێش
کڵاوە شەرابیەکەت لەسەر بکە
ئەو کراسەی کەوا کەمێ بەر لەئێستە لەبەرتا بوو
هەر ئەویان لەبەر بکە
زوو پەشیمان ئەبمەوە ، کێ ئەڵێ تۆ خوشحاڵ ئەبی ؟
کێ ئەڵێ تۆ تورەنابی لێم ناپرسی
کێ رێی داوە لەم ماڵەبی ؟
دیسان تێهەڵئەچمەوە و
ئەمجارە خەریکە بڵێم وەک ( ساندی بێل ) سبەینێ پرچت
بیەستە
هەتا ئێستا هەر مناڵیم بە عەشقی ئەو کچە مەستە

کەمێک دوور ئەکەویتەوەو
بەشان و ملی ڕووتەوە دەست ئەدەیتە ئەو کاسێتەی
لەتەنیشت ریکۆردەرەکەت بە بێنازی دانیشتووە
ئەیخەیتە نێو ریکۆردەرو مۆسیقایەک بە کوڵ ئەگری
وا هەست ئەکەم زۆر دەمێکە مەراقی هەڵنەڕشتووە
دوای ئەوە دێیتە تەنیشتم رائەکشێی
تۆ هەست ناکەی من هەر لە سەرچرپاکەم و
لەشم بەر لەشت ئەکەوێ
من خەیاڵم ،وەک قەڵەملێو ماچەکانم لەسەر لەشت دەرناکەوێ

ئەروانمە چاوەکانت وئاگام لێیە کە لەبەر خۆتەوە ئەدوێی
تا گوێم لەناوی خۆم ئەبێ هەر دڵنیانیم شەیدای کێی
دێرێ شیعری من ئەڵێیت و هەر پێنازانی من لەوێم
لە ناکاو ڕا ئەچڵەکێم، کە ئەزانم خۆشتئەوێم
ئیتر بە ئاگا دێمەوە
مامۆستاکەم هەر وانەکەی ئەڵێتەوە و
لەبەردەم تەختە ڕەشەکە راوەستاوە
سەرەی منە وەڵامی پرسیار بەمەوە
پۆلەکە هەمووی هەستاوە

ئەڵێ رۆڵە ئادەی هەستە

چۆن دووای زانیاری ئەکەویت

ئەڵێم مامۆستا من ئەفڕم

بەبێ ئەوەی رابوەستم ئەتوانم چەند میلێ ببڕم

لەو کاتەدا هاورێکانم پێئەکەنن

تومەس هێشتا نیوەمەستم

ئەڵێم ببورە مامۆستا نەمزانی وتت بۆ هەستم

پرسیارەکەی ئەڵێتەوە ئەو مەبەستی لە هەواڵە

ئیتر وانە تەواو ئەبێ و منیش هەر تۆم لە خەیاڵە

## کریسمس

گۆڵم چوومە سەرچناریش

هەستم ئەکرد لەلای خەڵکی .. زۆر ڕووخۆشتر بوو لە پاریش

ئەو درەختەی لەبنیابووم

هەستم ئەکرد پێی سەیر بوو من تەنیا بووم

هیچم نەوت ..

بەجێم هێڵا وەک باڵندەیەکی بێ بەخت

لەو کاتەدا هەستم پێ کرد زۆر شت مابوو فێرم بکەی

وەک زمانی مەل ودرەخت.

لەسەرچنار هەموو شت وەکوو خۆی مابوو
تەنیا ئەو ئاوە ڕۆشتبوو
کە تۆ پار لەوێنەکەتا
هەتا ئەژنۆ پێت تێنابوو.
پالأسیش ئەمشەو جلێکی ئالأو والأی لەبەرابوو
سنەوبەری یەکەم گۆشەی باخی گشتیش
وەک پاری تۆ ..
کلأوێکی پۆپەشمینی لەسەرابوو

خۆزگەم بە پار
لە بیرتدیٚ کە سەعات بوو بە دوانزەی شەو
ماچێکی جوان وناسکمان هەستان لەخەو..
من ئەزانم جێی بڕوا بووم
بڕیاروابوو نەیدرکێنم
بەو ماچە خۆی سوێنت دابووم
بەڵام گوڵم
ئەگەر بیر بکەیتەوە باش
تۆ پێت ووتم لەلای خەڵکی مەیدرکێنە
پێت نەوتم بۆ کامێراش .

## هێلا هۆپ

ئەوا خەریکە تەمەنمان تاریک دادێت

هێشتا دڵم نەهاتووە تورەبم لێت

بەسەدان شەو...

سەرم خستۆتە سەر شانی شیعرێکی جوان و گریاوم

بەڵام هێشتا لێت نەبیستووم

بڵێم تۆ ئازارت داوم

ئیتر ئەمە دواجارمە گوێت لەمن بێ

لێم ببورە با ئەمجارە کەمێ گلەییت لێبکەم

خۆ ناشزانم

لەچیەوە دەست پێبکەم

هیچم بۆ تۆ نەکردووە

دڵنیابە ئەوەش زۆر بەکەم ئەزانم

کە جوانیی تەمەنی خۆمم بەتۆ داوە

هیچیش گلەییت لێناکەم

کەوا دڵمت بەبێنازی لەسوچێکی ژورەکەتا فڕێداوە

لەدڵەوە لێت خۆش ئەبم

لەسەر ئەوەش کە لەگەڵم بێبەڵێن بووی

بۆ ساتێکیش پەشیمان نیم

کە بۆ سەدان شیعری گریاوم هەوێن بووی

ئەو چەپڵانەش ، کەوا لەکۆڕەکانمدا

خەڵکی بەتۆیان ئەبەخشی

هیچی داوا ناکەمەوە

لێم ببورە دڵم پڕە

دەنا هەرگیز کای کۆن بەبا ناکەمەوە

ئەو گوڵانەش کەوا خەڵکی
لەبەر جوانی شیعرەکان و ناسکی تۆ
بەدیاری بۆیانهێناوم
هەر هەموویم بۆت داناوە
هەرچییەک بۆنی تۆی لێبێ
هەتا ئێستاش لەسەر چاوە

دڵم خوشە بەوەی کە زۆر خۆشمویستوی
بەڕادەیەک...
کەوا وشەی ( خۆشەویستی ) خۆی سەرسامە
هەر لەبەر تۆ نەمهێڵاوە
دڵم هەست بکا ناکامە

خۆ دڵم هەرچەند مناڵە
بەڵام جارجارەش هەست ئەکا
دەستی دەستێت پێکردووە
دایم پێی ئەڵێم عاقڵ گیان
تۆی خۆشەوێ
تۆ هەستت پێنەکردووە

هەر بۆ ئەوەی دڵم لەخۆی دانەمێنێ و
پێی نەزانێ .. دەستت ناوە بەڕوویەوە
ئەم ئێوارە کەمێ بردم بۆ سەرچنار و دەباشان
هەر لەبیری نەچوویەوە
جاران لێم ڕانەئەبینیت
دڵێکی منالْ بگرێنی
بەڵام پێئەچێ بتوانی
وردی کەیت وبیشکێنی

٣٠

توخوا دڵم زۆر مناڵە

فێربووە لە شیرین خەودا

شەوانە ڕائەچڵەکێ

خۆم وام لێکرد ئاخر تازە

دادی ئەو ببەم بۆ لای کێ ؟!

ئەو ئێوارەی کە دوای ساڵێ
بەرێکەوت یەکمان دیەوە
دڵم ئەوەندە پەرۆش بوو
هەڵئەپەری لەتاوانا
بەڕادەیەک هەستم ئەکرد بەترپەی پێی
خۆ ئەوکاتە یەک ساڵان بوو ، لەتاوانا هاتە زمان
بیرتە لێی پرسیت تۆ لە کوێی ؟!

هەناسەکەم..
تاکەی تۆی بیرببەمەوە
بەپەشەمک وهێلا هۆپ و
بەپەتپەتێن وجوڵانە
دڵ ومەل زۆر لەیەک ئەچن
کەلێیان تێکبەی هێلانە

چەند رۆژێ ئەبێ فێر بووە
بەیانیان لەخەو هەڵئەستێ
دائەنیشێ بەدیار سپەیستونەوە
تا ساندیبێل دەست پێ ئەکا..
تا ساندیبێل دەست پێ ئەکات
دڵم ئەگری و نابێ بڕۆم
بەبۆنەی ساندیبێلەوە
بۆ زانکۆی نابەم لەگەڵ خۆم

دوێنێ بوو کچێکی ئەسمەر
رایگرتم و
خۆشەویستی بۆم دەربڕی
کەزانی من بێ وەڵامم
لێم توڕە بوو
لەتاوا دەنگی هەڵبڕی
پەنجەی بۆ سنگم راکێشاو
ووتی خودا دڵی لێرە دانەناوە ؟
ووتم با ، نایەتە دەرێ
لەماڵەوە جێم هێڵاوە .

# مەهێڵە کاڵ ببیتەوە

بەو هاتنەت
تۆ هەموو ئارامی منت هەژاندبوو
داروبەردو
گوڵەکانی ئەو ناوەشت گریاندبوو
کە هاتبووی
درەختەکان بەچپە ماچیان کردبووی
جوتێ کورسی چاوەڕوانیش
تێر بۆنی پرچیان کردبووی
ڕازێ لەوێ چاوەڕوان بوو
دڵی پڕ قوڵپی گریان بوو

لەوێ نەبووم تابە سەرتا

گریانی ساڵێ بڕژێنم

ئەو بۆنەی شەوان بۆت ئەگری

بەباڵاتیدا بپڕژێنم

تۆ نازانی چ ڕازێکی پڕ لە تاسەی دڵی منیت

لەهەموو شوێنی ئەتبینم

هەرچەند ساڵانێکە ونیت

لەو ڕۆژەوەی بەدوا نامەت دڵی منت شکاندووە
چاوەکانم لە ئاوێنەی ژوورە کەتا ڕواندووە
هەرچەندە خۆتت گۆڕیوە
چەند جار پرچت داهانیوە
تەنانەت فرمێسکەکانت
لەوماوەدا هەمووم دیوە

تەنانت ئێوارەیەکیان
نازانم بۆ دڵت تەنگ بوو
نەمزانی بۆ هەموو دنیا
لەبەر چاوت شەوەزەنگ بوو
بەدەم کۆڵی مەراقەوە
هاتی دەرگاکەت کردەوە
لە بەر ئاوێنەی ژوورەکەت
پرچت وشک ئەکردەوە
کەبینیتم...
دوو دڵۆپ فرمێسکی چاوم
لەئاوێنەکەوە تکا
واتزانی تکەی پرچت بوو سڕیت و نەچووی بەشکا

هەر کە ژوورەکەت جێدێڵی
چاوەکانم چاوەڕوانن تادێیتەوە
برینێکی لەسەر دڵم
ڕۆژی دەجار ئەکولێیتەوە
کە شەوانی زستان ئەنووم
بۆ ئەوەی دڵم لات نەبێ
دەستەکانی خۆم ئەنێرم داتبپۆشن
بۆ ئەوەی تۆ سەرمات نەبێ .

زۆر شەوانەش واهەست ئەکەم
ترپەی دڵم ئەبڕێریت
بۆم بنوسە توخوا خۆتی
یا هەستەکانت ئەنێریت ؟ . .
هەر کە ئەمەوێ بتبینم
هێندە بەحەسرەتەوە دێم
درەختەکانی ئەو ناوەش
ئێستا هەموو بوون بە هاوڕێم

تەنانەت بەیانییەکیان
زۆری نەمابوو بتگەمێ
ویستم نامەیەکی ئاڵی
پڕ لە خۆشەویستیت بەمێ
بەڵام درەختێک پێی ووتم
با پەشیمان نەبیتەوە
تۆ کوڕێکی پڕ لە ڕەنگی
مەهێڵە کاڵ ببیتەوە .

## پۆسكارت

ناتوانم باوەڕ بهێنم ، كە ئیتر تۆ
هەتا مردن دوور ئەبیت لێم
لەوەتەی بڕیارتداوە
هێندە ونم نازانم كێم
بڕوا بكە بڕواناكەم هەتا سبەینێ بمێنم
ناتوانم هیچیش بنوسم
یەكەمجارە خۆم ئەبینم
بەدیار لاپەرەیەكەوە دابمێنم

ڕازێ لەناو دڵما ئەگری و
هەرچەند ئەکەم ، بۆمناکرێت بە هۆنراوە
هێشتا زووە جێم مەهێڵە
دڵم قسەی زۆری ماوە
لەهەنسکەکانم نەبێ چرپەی تۆ لە هیچ کەس ناچێ
وەرە سەیری چاوم بکە
ئەم دڵۆپە چاوەڕوانە ، تا دڵۆپەکەی تر لاچێ

جێم مەهێڵە هەناسەکەم من ئەم تەنیاییە فێر نیم

تەنیا لەبەر بینینی تۆ

دایم سوپاسی خوا ئەکەم ، کەوا کوێر نیم

دیەکانم زۆر ڕۆمانم خوێندۆتەوە

تاڵ تاڵ پرچی زۆر چیرۆکی خوشەویستیم هۆندۆتەوە

هیچ عاشقێکم نەدیوە هێندەی من و تۆ ناکامین

هەر هیچ نەبێ ڕێگەم بدە

با وێنەکانت لەلام بن

هەرهیچ نەبێت
بمخەرە ناو ئەلبومە جوانەکەتەوە
پۆسکارتێ بم پێم باشترە
لەم کوڕە مردووەی کە هەم
هەر هیچ نەبێ ، کە ئەلبومەکەت دائەخەی
لێوم ئەچێتە سەر لێوی وێنەیەکت و ماچت ئەکەم

لەدڵی خۆت دەرمبکەی
وا هەست ئەکەم ئەم دنیایە منی هەر لەبیر کردووە
ئەگەر درەنگ گەڕایتەوە
تەمەن نییە ، دوریت منی پیر کردووە
ئەمشەو حەز ئەکەم بۆنتکەم
حەز ئەکەم تێر بۆت بڕوانم
چونکە سبەی گەر بتبینم
زۆر دڵنیام کە ناتوانم

نازانم من بۆ ئەوەندە تۆم خۆشئەوێ
بۆچی ئەوەندە شەیداتم
بیرتە دەمەو بەیانێکی چوار ساڵ بەر لە ئێستەی تەمەن
چاوەڕێم بووی
لێم ببورە درەنگ هاتم
لێم ببورە گوڵم ئەگەر جار جار تۆم زویر کردووە
دڵنیابە دڵرەقی تۆ
من هەمووم لەبیر کردووە

دەمەو عەسرانێ پێموتی ڕقم لێتە
دڵنیابە زۆر درۆمکرد
لەتاوانا هەتا درەنگ
بەشەقامەکەی سالما هاتوچۆمکرد
بە جۆری گریان گرتوومی
ڕەنگە دڵم بتکێتە سەر لاپەرەیەکی بەردەستم
ئەگەر تکا بۆت ئەنێرم
تا بزانی چۆنە هەستم

توخوا گوڵم ئێستە لە کوێی .

وای چەنێ هەست ئەکەم تەنیام !..

خۆزگە سبەی کە ئەمبینیت

تێر بەسەر شانتا ئەگریام

هەناسەکەم بێ هۆ نیە کە هەست ئەکەم بەجێماوم

چی یادگاریمان هەیە

هەموو دێنەوە بەرچاوم

ئەو بەیانیەت لە یادە

ڕەفتەیەکی بۆنخۆشی خۆت هانی بۆ من

تۆ ئەزانی ئەو ڕۆژانە لە تەمەنمدا چەند کەمن ؟

ئەو بەیانانەت لە بیرە

بەسۆزەوە شیعرەکانی انزارات بۆم وەرئەگێڕا

ئێستەش لە بیرمە چەند گریام

لە نێو باوەشی دوو دێڕا

( ان کنت تریدین السکنا

اسکنتک فی ضوء عیوني )

بۆ چی نەگریم  دوای ئەو هەموو دێڕە جوانە

ئیتر چاوی من نەبینی

هەناسەکەم ، ئای کە دەستوخەتت جوان بوو
بە بینینی پیتەکانت
وای کە دڵم شادمان بوو
تۆ بووی منت کرد بەم کوڕەی کە ئێستە هەم
لەبەر ئەوە بشمکوژیت
هەموو مافێکت پێ ئەدەم
ئەگەر تۆم خۆشنەویستایە
نە ئەم کوڕەی ئێستا ئەبوو
نە ئەم هەموو شیعرە جوانەش
نە ئەم بورکانەی ناو دڵم
نە ئەم هەنسک وگریانەش

ئەم شیعرە گریاوەی ئەمشەو
ئەگەر بۆتۆ دوایین نامەی دڵداریم بێ
ئەپارێمەوە لە خودا
ئەمشەو خەوی یەکجاریم بێ
من دڵنیام ئێستا تۆش وەکو من ئەگریت
دەستت باوەڕت پێ ناکا
جارێکی تر دەستم نەگریت

من ئەزانم تاوەکو خەو ئەتباتەوە
ئەمشەو دڵت پەڕە پەڕە
شێوەی من هەڵئەدەتەوە
هەمویت دێنەوە بەرچاو
هەرهەموو کراسەکانم
ڕەنگی زەردی ڕۆژەکانم
هەموو بۆیمباخەکانم
جاروباریش وەک چرپەیەک دێنە بەر گوێت
گشت ناسۆر و ئاخەکانم

لە بیرت دێ بەیانیەک

تەنیا مێزێک من وتۆی لەیەک کردبوو

هێشتا هەستت ئەکرد دوورم

توند توند دەستمت گرتبوو

ئەومت بیرە کە من ئاهێکم هەڵکێشا

ئەو ئاهەت چەند پێناخۆش بوو

منیش لە تاوا پێموتی دملێی گەڕێ بۆ لای تۆ هات

ئەوە ئاهێکی دڵخۆش بوو

لەو ڕۆژەدا دڵمان لە دوو مناڵ ئەچوون
بیرتە وتم، ئەها چۆنی یاری ئەکەن
کەسمان لێیان تووڕە نەبووین
دڵمان نەهات پێیان بڵێین هاری مەکەن

بیرتە دڵمان چەنێ بەناز پەروەردە کرد تا گەورە بوون
چیبکەین چارەنوسیان وابوو
بۆ یەک نەبوون
من ئەمشەو باوەڕم وایە
خودا دوو دڵی سەردەمی کۆنی بۆ ئێمە هێناوە
ناو سنگی من دڵی مەم و
ناو سنگی تۆش...
دڵە جوان وناسکەکەی خاتوزینی تیا داناوە.

## خانەی کچان

پێمناخۆشە...

ئەو کاتانەی کە پرچت تێکئەچێتەوە

ئەڕۆی بۆ خانەی کچان و

لەو باخەدا منت لە بیر ئەچێتەوە

من ئەوەندە تۆم خۆشئەوێ

هاکا ڕۆژێ

لە لاپەڕەی ڕۆژنامەیەکا ئەیبینی

ئەڵێن کوڕێ

ئاوێنە خانەی کچانی بۆ ماڵی خۆیان دزیوە

لەبەر ئەوەی دڵدارەکەی پرچی لەبەر داهانیوە

ڕۆژنامەکە ئەڵێ کوڕەکە گیراوە
دادوەر بەناو پەڕەکانی گشت (ماددە) کانا گەڕاوە
عەشقی ناو دڵی دزەکەی پێ زیندانی نەکراوە
دواتر سەرۆکی دادگا ئاوێنەکەی داوە بە خۆی
داوای لە زانکۆ کردووە
گرنگ نیە خانەی کچان با ئاوێنەی تر بکڕن بۆی

دوای ئەوە، سەرۆکی زانکۆ وتارێکی تر ئەنوسێ
ئەڵێ ئەگەر لێی خۆشببن
ئەچێتە پۆلی کچەکەو کورسیەکەشی ئەدزێ
کۆمەڵناسێ دێتە وەڵام
ئەڵێ سەرۆکی زانکۆش بێ هەر وائەکا
پشکۆی عەشق ئەگەر بە دڵیا بچزێ

لەو ڕۆژەدا ، ئەو ڕۆژنامە بەرناکەوێ
تۆش ڕائەکەی بۆ کۆشکەکە و
یەک ژمارەت دەست ناکەوێ
گوێت لێئەبێ کوڕێک ئەڵێ
لەوەتەی هەم یەکەم دزییە ئەیبینم کە ڕەوایە
کچێکی تر پەنجە بۆ تۆ رائەکێشێ
ئەڵێ دزی ڕۆژنامەکە بیستومە لەگەڵ ئەوایە
کە ئەزانیت عەیب نیە دزییەکەم
تێر تێر ئەگریت
لە دوای ئەوە بەبێ شەرم
لە زانکۆدا دەستم ئەگریت.

## تەختە ڕەش

خۆشەویستم
کە لە پۆلا دائەنیشم
ورد بۆ تەختەکە ئەڕوانم
خێرا مامۆستا پێم ئەڵێ
ڕۆڵە هەستە وەرە پێشێ
پێئەچێ ئەویش بزانێ
شتێ هەیە ڕامئەکێشێ
خۆ مامۆستاکەم سەدان جار
تەختە ڕەشەکەی سڕیوە
کەچی هەر ناکوژێتەوە
وا چاوت لەمن بڕیوە

خوێندکارەکەی تەنیشتیشم
وەک ئەوەی بمخوێنێتەوە
زوو زوو ئەکێشێ بەدەستماو
دلی ڕۆشتوم دێنێتەوە
ئەم سەری ساڵە بێتەوە
گوڵم بۆ کارتەکەم ناچم
دڵنیام جگە لە عەشق
لە هیچ وانەیەک دەرناچم.

## قاوە

لە پاش ئەوەی بۆ دوایین جار بەجێت هێشتم
چوومە قاوە خانەیەک و
دڵنەوایی ئەو ئازارو زوخاوەم کرد
دانیشتم وپاش کەمێ داوای قاوەم کرد

کە قاوەکەیان بۆ دانام

چاوت لە فنجانەکەدا بۆ چاوەکانمی ئەڕوانی

ویستم لێومی بۆ بەرم ، بۆ قاوەکە نا بۆ چاوت

بەڵام چەنم کرد نەمتوانی...

هەستام بڕۆم

هەتاوەکو کەس نەزانێ کە من لە مانگی گریاندام

لەبەردەمما ئاوێنەیەک دانرابوو

بۆ خۆم ڕوانی تۆی نیشاندام

چومە دەرێ لەوبەری شەقامەکەوە ڕاوەستابویت
پڕ پڕبوویت لە دڵە ڕاوکێ
هەر ئەهاتیت وئەچوویت و دەستت ئەکێشا بە دەستتا
ڕام کرد بۆ لات پێت نەگەییم
چونکە تەکسیەک بۆت وەستا

منیش تەکسیەکم ڕاگرت داوام لێکرد شوێنت کەوێ
بەو خەیاڵەی دابەزیت وبێیت لەگەڵ منا سەرکەویت
برِوام نەبوو کەتۆی تێدا دەرنەکەویت
ووتم خاڵە گیان ڕاوەستە
بمبەرەوە بۆ ئەو شوێنەی کە سەرکەوتم
لە دڵی خۆمەوە ووتم بۆ ئەو شوێنەی
کە دوای تارمایی ئەو کەوتم

چوومەوە قاوەخانەکە...

بەو خەیاڵەی لە ناو فنجانێکی ترا ماچتکەم و بتدۆزمەوە

نەمئەزانی قاوەی دووەم تۆی تێدا نیت

هەل یەک جارە وئەبوو زوتر بیقۆزمەوە

کە قاوەکەیان بۆ دانام فنجانەکە کەمێ لێوی قرنجابوو
قاوەکەی لێوە ئەتکا
بە ابۆیا ە کەم ووت بۆ وایە؟
ووتی کەمێ بەر لە ئێستا کچێکی ناسکی غەمناک
لەم شوێنەی تۆ دانیشتبوو لەگەڵ کچێکی بەنازا
ئەم فنجانە لە پەنجەی ئەوا ترازا

ئەو قسەکەی تەواو کرد و تەواو نەکرد
وەکو نورێ
هاوڕێیەکی لە مێژینەم هاتە ژوورێ
تا هاوڕێکەم پێی نەوتم نەمزانی کە تۆ بوی هاتوی
تۆ دانیشتوی لەم شوێنەدا
ئێستا زانیم بۆ ئەوانەی وێڵی بەختن
بۆی ئەگەڕێن لە فنجان وئاوێنەدا.

## خەوێک

ئەمشەو لە خەونمدا مردم
بڕوام نەبوو بەو دڵە پڕ لە سۆزەوە
خوای میهرەبان لێم نەبووری
لەبەر ئەوەی بە چاوت سوێندم خواردووە
دەرگای بەهەشتیان داخست و
نەیانهێڵا بچمە ژووری.

ئەوانەی کە قۆڵیان بەستم
باڵایان داپۆشرابوو بە گڕ و ئاگر وئاسن
بڕوام نەبوو ، دڵێکی عاشق نەناسن
پێم سەیر بوو بەو جوانیە
فریشتەیەکی سەر شانم دەستی کرد بە دوو زمانی
هەر چیم پێبوو لە گیرفانم دەریانهانی

نامەیەکیان کاتژمێرێ پێش مردنم نووسیبووم بۆت
ناسک بوو ئێجگار ناسک بوو
هێندەی ناسکی دڵی خۆت
کەسێ نەبوو گوێم لێبگرێ
هەتا توانیم هاوارم کرد لە تاوانا
چونکە هەر باوەڕم نەکرد من نوقم بم لە تاوانا
بەر لەوەی تەواو بسوتێم ئیتر چاوانم کردەوە
ئەو نامەیەی بەدیاریەوە شل شل خەوم لێکەوتبوو
لە نوێ دەستم پێکردەوە.

# مەم و زین

دوێنێ درەنگ چوومە ژوورێ
ماموستای کوردیمان ویستی لێم ببورێ
بەڵام کە ویستم دانیشم
لیفێکسەکەم کەوتە خوارەوە لە دەستم
ماموستا کەوتە گومان و
ئیتر هەستی پێکرد مەستم

هەر خوێندکارەو پەڕەیەکیان هەڵگرتەوە
کە لیڤێکسەکەم لێکەوت
بەڵام نامە تازەکەی تۆ
بەر دەستی مامۆستاکەم کەوت
خۆی ڕانەگرت خوێندیەوە
کە بینی لە دێڕەکانا
من وتۆ چەنێ بە مەستی بۆیەک ئەژیین
وتی ڕێزمان لابەرن و وانەکەی کرد بە مەم و زین.

## قەڵەم لێو

ئەی دڵە شێتە دوورەکەم
ئەبێ ئەمشەو نامەیەکت بۆ بنووسم
پڕ بێ لە خەمی زۆرەکەم
بەڵام بەچی دەست پێ بکەم
دڵی پڕی گڵۆپەکان
یا بە خەمی چاوەکانم و دڵۆپەکان

وا دانیشتووم لەگەڵ پێکێ
جار بەجارێ لێم ئەپرسێ
ئەم هەموو مەراقە بۆ کێ ؟
ڕەنگە ئێستە لێم بپرسی
چۆنبێ پێکەکەت نەیزانی ؟
بڕوابکە دڵم نەهات
تاڵتری بکەم ژیانی

وا دوو ڕۆژە لەگەڵ گۆرانیەک ئەژیم
سەدان جار گوێم لێ گرتووە
وا هەست ئەکەم هەناسەی تۆی
لە سینەیا هەڵگرتووە.

لەولاشەوە کاتژمێرەکەم ڕێ ئەکا
بەناچاری کاژێرێکی پڕ لە حەسرەت دەست پێ ئەکا
ئینجانەی بەر پەنجەرەکەش
زۆر زۆر هەواڵت ئەپرسێ
ئەڵێ من لەبیرینا کەم
لەبێ لوتفی من نەترسێ

دیارییەکی ناسکیشم بۆت کڕیوە

لە ئێوارەوە چەند جارێک

فرمێسکەکانیم سڕیوە

ڕەنگە ئێستا لێم بپرسی

خۆ نەمدیوە

بۆچی ئەگرییکە ئەو منی نەناسیوە

هەناسەکەم
ئاخر ئەو لە گۆشەیەکا دانیشتوە
گوڵەکانی دوو ئینجانەکەی تەنیشتی
وەک پەپوولە
فرمێسکیان لێ هەڵنیشتووە
ئەو وێنەکانت ئەبینێ بە دەستمەوە
ئەو پۆلە ماچەش ئەبینێ
کە هەڵئەفڕن
لە ناو گوڵزاری هەستمەوە

گوڵم سڵاو

بۆ هەموو ئەو دیمەنانەی دێنە سەر رێت

بۆ ئەو شەقامە ناسکەی

یەکەم جارە لەگەڵتا دێت

ئەپارێمەوە لە ئاسمان

فرۆکەکەت توند توند بگرێتە باوەشی

بە ئومێدم ئەو ئێوارەی کە تۆ ئەڕۆی

خۆشبێ کەشی

دڵنیاشم هەرچیەکت بۆ بنوسم
ناگاتەوە بە چرپەیەک
بێتوو خۆی بدا بە گوێتا
وەک باڵی پەرە سێلکەیەک
بڕوام نەبوو ڕۆژێ دادێ
پێویستم ئەبێ بە نامە
بۆ ئەو کچەی هێندەی بەهار
بیرەوەری سەوزی لامە

هەفتەی پێشوو سلێمانی
چەند شارێکی خانومان بوو
شۆستەکانی لەبەر چاوم چەنێ جوان بوو
هەر ئەو شارە ئێستا ئەڵێی پایز هەڵیوەراندووە
واهەستەکەم بروسکەیەک
باڵای گشت درەختەکانی سووتاندووە

له بیرم دێ که منداڵ بووم
جارێک مامۆستا پێی ووتین
سەرچاوەی هەموو ڕەنگەکان
پەڕەی گوڵن
خۆزگە ئەمووت نا مامۆستا خۆشی دڵن

سبەی لە ڕۆژنامەیەکا
ئەم نامەیە تۆمار ئەکەم
باسی ئەم تەنیاییەی دڵ
بۆ هەموو خەڵکی شار ئەکەم
بۆ نوسینی ئەم نامایە
کە دەفتەرەکەم کردەوە
چاوانی شار وەنەوزی خەو ئەیبردەوە

کە دوایین دێڕم تەواو کرد
شار چاوانی هەڵهانیبوو
بۆیە نوسیم بەیانیت باش
چونکە لای تۆ بەیانی بوو

لێم ببورە خۆشەویستم
ئیتر دووری ڕێم پێ نادا
زۆر بەیانی بگەمە لات
قەڵەملێویێکم ناردووە
لەبری خۆم ماچت بکات

## بیرەوەرییەک

ئەمشەو بیرم لێت کردەوە
خەیاڵێکی زۆر ناسکم
بۆ کۆڵانی بیرەوەریی یەک بردەوە
ئەو ئێوارەم هاتەوە یاد
کە شەڕمانبوو لەسەر ئەوەی
کاممان یەکترمان لەوی تر زیا خۆش ئەوێ
تۆ دەستت کرد بە گیرفانتاو
ووتت من ئەم نامەیەی تۆم
بۆ خۆم کردووە بە هەوێ

خۆ ئەزانم درۆت نەکرد
ئێستاش هەر نامەکەت لایە
بە شەوانە هەتا بەیان
دەستێکەو هەر لە ملتایە
بەڵام ئازیز من گرەوەکەم بردەوە
خۆ هەر من زیاتر شەیدات بووم
تۆ هەر بەڕاستی لەدڵمای
بەس من بەنامە لەلات بووم.

## جوانترین نامە

هەر کە نامەت بۆ ئەنووسم
بە ئەسپایی پێنوسەکەم بەسەر پەڕەکەدا دێنم
دڵی تۆ ئێجگار ناسکە زۆر ئەترسم بیڕوشێنم
لەسەر هەزارەها پەڕە نوسیوومە من تۆم خۆشئەوێ
بەڵام دەستە نەرمەکانت ، جوانترین پەڕەی نامەٚ بوون
ئێستا ئەڵێم ئەو پەڕانە خۆزگە هەمیشە لام ئەبوون .

## گریانێک

عەیامێکە بیرت ئەکەم
بەڵام هەرگیز
ناهێڵم هەستی پێبکەی
من دڵنیام ئێوارەیەک تۆش پڕ ئەبیت لە گریانێ
ئاخۆ کەی دەستی پێبکەی !

هەرچیم هەبوو
مناڵی و ئەوین و مەستی
تۆ ونت کرد
خەوێکی جوان ئازیزو دەزگیرانم بوو
لەمنت کرد

بەڵام چی بکەم

لەبەر ئەوەی هەتا ئەمڕۆش

هەر لەلای دڵم ڕوو سوریت

من ئەتبوورم ، ئەگەر تۆ لەخۆت ئەبووریت .

## گۆرانییەک

ئەی دڵە شێتە دوورەکەم
ئەمشەو گۆرانیەکی جوان
تۆی هێناوە بۆ ژوورەکەم
ووشەکانی زۆر ناسکن
وەکو لێوە تەڕەکانت
مۆسیقایەکی لەگەڵە
جار جار لەناکاو هەڵئەچێ
کوتومت وەک شەڕەکانت

ئیستا فێربووم هەر ئێوارەی
لەگەڵ گۆرانیەک ئەدوێم
بۆیە تۆمارگەکانی شار
یەک بەیەکیان بوون بە هاوڕێم
تۆ دنیای منت کردووە
بەگۆرانی وشیعرو بەستە
ئێستا تەنیا تۆو گۆرانی
ژیانی منتان بەدەستە

## گۆرانییەک

ئەی دڵە شێتە دوورەکەم
ئەمشەو گۆرانیەکی جوان
تۆی هێناوە بۆ ژوورەکەم
ووشەکانی زۆر ناسکن
وەکو لێوە تەڕەکانت
مۆسیقایەکی لەگەڵە
جار جار لەناکاو هەڵئەچێ
کوتومت وەک شەڕەکانت

ئیستا فێربووم هەر ئێوارەی
لەگەڵ گۆرانیەک ئەدوێم
بۆیە تۆمارگەکانی شار
یەک بەیەکیان بوون بە هاوڕێم
تۆ دنیای منت کردووە
بەگۆرانی وشیعرو بەستە
ئێستا تەنیا تۆو گۆرانی
ژیانی منتان بەدەستە

## کاتەکان

بەیانیان شیعرێ
عەسران خەیاڵێ
ئێوارە گریانێ
نیوەشەویش خەوێ
بێ لەوەی لە دڵی خۆمەوە
ڕۆژانە سەدان جار
ئەڵێم تۆم خۆشئەوێ

## مەودا

گوڵم مەودای نێوان ئێمە
زستانێکی پڕ لەیادگاری و بارانە
نازانم بۆ بیرت ئەکەم
نزیکە زستان بێتەوە ؟
یان یادەکانی جارانە !

زۆر ئێواران شەپۆلی سۆزم بۆ ناردوی
نازانم چەندیان گەیوە
گرنگ ئەوەیەبزانی ، تۆ لە زستانی پارەوە
چرپەکانت لەناو دڵمدا مەیوە

بۆمنێکی هەناسەسوار
هەواڵێکت ئەوەندەی نەفەسێک ئەبێ
عاشقێک هەیە ئەم باران بۆ ئەو باران
گوێی لە چرپەی کەسێک ئەبێ .

## چۆنی ؟

گوڵم ڕەنگە سەیربێ لات
کەسێ نامەبنوسێت و
خۆیشی بیبات
ئاخر نامەکەم هی دڵمە
من چاویشم بیرت ئەکات

لەو ڕۆژەوەی تۆ لێم زیزی
من ئەوەندە دڵشکاوو
وردوخاشم
هەر کەسێ پێم ئەڵێ چۆنی
ناڵێم باشم

ئەو دڵرەقیەت کوشتمی
نیگای پڕ گلەییت تا کەی
وەکو ئێستا خۆشەویستی دەرنابڕی
شەڕێکیشم لەگەڵ ناکەی

## ڕژان

ئەمشەو دڵی خۆم خەڵەتان
کە داوای کرد تۆ ببینم
هێنام بۆ کۆڵانەکەتان
ئیتر ئەبوو بیدرکێنم ، چارم نەبوو
بەڵام کاتێ بڕیارمدا ، زارم نەبوو
بە تەزوی لەشم تێمگەیاند
تۆ ئێستا لێرە نەماوی
وائەزانێ بەو گریانەی دوێنێ شەوم
لەچاوانمەوە ڕژاوی

## چپە

هەر کە نامەت بۆ ئەنووسم
دڵۆپێ فرمێسکی چاوم
بەسەر پەڕەکەدا ئەتکێ
هەست ئەکەم بە چپە ئەڵێ
مەینێرە بادڵت نەشکێ
لەنێوان تۆو گریانێکا
بە خەیاڵەوە ڕاماوم
نازانم دوای دڵم کەوم
یا چپەی فرمێسکی چاوم .

# مێز

خۆشەویستم سەیرم لێ دێ
بەجێم دێڵی و
لەسەر دوا بڕیارت سووریت
لەبیرت دێ زۆر ئێواران
مێزێک لە نێوانماندا بوو
هێشتا هەستم ئەکرد دووریت

یادگاری پیاسەکانمان نەبوونایە

ئاسان ئەبوو لەبیری خۆمت بەرمەوە

بەڵام تازە چۆن نەخشەی شار تێکبەمەوە

ئەی چۆن ئەو هەموو شەقامە

لەنوێ دروست بکەمەوە ؟!

## بکەر

مامۆستای کوردیی وایزانی
کەبە ئاگای هێنامەوە
منی لە خەیاڵی دووریت دوور خستەوە
داوای بکەری لێکردم
ناوی تۆم خستە ڕستەوە

بۆ سبەێنێش دارِشتن بوو
هەر کەسەو بەئارەزووی خۆی
منیش باسی خۆشەویستی تۆم نووسی بۆی
ووتی ئەوەی تۆ ونبووە
ئەو ڕۆژەی کە نمرەکانی هێنایەوە
نەمزانی بۆ
لەتوێی گشت لاپەڕەکانا
بەس ئەوەی من توایەوە .

## بۆدی

ئەو بەیانیەی
کراسە سوورەکەت لەبەر کردبوو
هاتیتە چاوەکانمەوەو
بۆ شەوەکەی کاتێ نووستیت
بە پێڵوەکانم داپۆشیت
بۆ بەیانی مامۆستاکەم
وتی ڕۆڵە تۆ سەرخۆشیت
هەستام پۆلەکەم بەجێ هێشت
بێ ئەوەی بڵێم بمبوورە
دڵنیابووم ئەو نازانێ ، من لەبەرچی چاوم سورە

## دنیا چۆنە ؟

ئەو ڕۆژانەی لێم ئەپرسن
دنیا چۆنەو لەچیدایە
ڕەنگی ئەو بۆدیە ئەڵێم
کەوا تۆ لەبەرتدایە

نیوەڕۆ چوومەوە ماڵێ
دایکم ووتی دنیا چۆنە
پێیم ووت پرتەقاڵی یە
ووتی ڕۆڵە تۆ چی ئەڵێی
ووتم دایە
ئەم دنیایە
ئەم دڵەی من هەر ئەوەندەی لێ حاڵیە

دوێنێیش دنیا هەمووی لە ئەرخەوان ئەچوو
چونکە بۆدیەکەی بەرت ئەو ڕۆژە ئەرخەوانی بوو
وێنەکانی ئەو کامێرام هاتەوە یاد
حاجیەکی دراوسێمان لە مەکە بۆمی هانیبوو .

## ئەدرەس

خۆشەویستم
لەهاوڕێکانمت پرسیبوو
کێ ئەدرەسێکی ئەزانێ
بۆچی سالأنێکە وونە ؟
بەشەقامی بێ کەسیدا وەرە خوارێ
کۆلأنێ ئەودیو تەنیایی ماڵی منە

خۆشەویستیت بەجۆرێک چۆتە خوێنمەوە
هەر نامەیەک ئەنووسم بۆت
بەر لەوەی بۆتی بنێرم
بەدەیان جار ئەیخوێنمەوە

ئاخر چیبکەم هەناسەکەم
من لەیەکەمین نامەوە
دڵم وەها ڕاهاتووە
خۆشم بینووسم هەست ئەکەم
لەتۆوە بۆ من هاتووە

ئەمشەو نامەیەکت وون بوو
تاوەکو درەنگ بۆی گەڕام
لەتاوانا بەدارو دیوارو مێزو
کتێبخانەی ژوورەکەما هەڵئەگەڕام
کاتێ پێمزانی بەخۆم بوو
تەواو توڕە بووم لەدەستم
بەگریانەوە پێی ووتم
لێم ببوورە بەخوا مەستم

## ئاوێنە

ئێستا فێربووم هەموو ڕۆژێک
لە ئاوێنەی ژوورەکەما
کاتژمێرێ ئەڕوانمە ڕووخساری خۆم
ئەڕوانمە ڕەنگی جل و چاوەکانم و
چۆنێتی شێوەی هاتوچۆم
خۆ هەرگیز لەبەر ئەوەنا
خۆم خۆش ئەوێ و شەیدام بەخۆم
خۆم خۆش ئەوێ لەبەر ئەوەی
کە ئێستا خۆشەویستی تۆم .

# OK

خۆشەویستم
لەو ڕۆژەوەی
کەوا ژمارەو کۆدی تۆم
لەناو دڵی مۆبێلەکەمدا داناوە
جێگەی کەسی تر ناگرێ
ئەو (OK) یە
هەزار جار پەنجەم پیا ناوە .

## پیانۆ

لەو باخچە پایزییەدا
تۆ زۆر دڵتەنگیت لێ جوان بوو
بۆیە منیش قوڕگم گیراو
چاوم عاشقی گریان بوو
هەستم بە ئاوازێ ئەکرد
ئەو کاتەی ئەمڕوانیە تۆ
کە گەڕامەوە پێم زانی
دڵم بووبوو بە پیانۆ

## فرمێسک

هەموو خەیاڵەکانی تۆم
لە فرمێسک تێر کردووە
ئەگەر هاتوو بەرێکەوت شەوێ خەیاڵێ
داوای گریانی لێ کردی
ئەوە من وام فێر کردووە

## کامێرا

ئەمڕۆ وسبەیە لەلاتم
میوانم وئەڕۆمەوە
بە کامێرای چاوەکانم وێنەت ئەگرم
ڕۆشتمەوە بە فرمێسک ئەیشۆمەوە.

## تەتە

خۆشەویستم هەتا پاریش
من بەخەمم ئەووت تەتە
لەوەتی کە تۆم ناسیوە
باڵای خەمم
دوو هێندەی خۆم کەڵەگەتە.

## مەرەکەب

ئەم بەیانیە کە هەستام
سەیربوو لام...
بەمەرەکەبی پەمەیی
لەسەر ڕوومەتم نوسرابوو
هێندەی چاوم تۆم خۆشەوێ
کاتێ کە بیرم کەوتەوە
سەرم لەسەر نامەکەت بوو
هەتاوەکو خەوم لێ کەوت دوێنێ شەوێ

## ترپە

ئەم شەو دڵم ترساندمی
هەستم ئەکرد بە ترپەی زۆر
بڕیارم دا
هەستم بڕۆم بۆ لای دکتۆر
کە خۆم گۆڕیو لە دەرگاکەمان چوومە دەر
ئەو کاتە بیرم کەوتەوە
ترپەکانی دڵی تۆیشی چووەتە سەر

# حەشر

هەناسەکەم دوێنێ شەوێ
ئەو دنیام بینێ بە خەوێ
کە نامەی کردارییان هێنام
جێگەی ماچێکی لەسەر بوو
کاتێ بۆ حەشر بانگ کرام
تەنیا ناوی تۆم لەبەر بوو

من خۆشەویستێکم هەیە
تەنیا جارێک چاوەکانمی ماچ کردووە
لەم دنیایە هەر ئەو تەنیا ماچەی ئەوە
ئەوەی هەمە
گەر نوێژ بکەم بۆ ئەو دنیا
تەنیا بۆ ماچی دووەمە

## سوێند

ئاو بەلەشما دێتە خوارێ
وەک ئێوارەکانی جاران
بیرتە پێکەوە سوێندمان خوارد
چەتر هەڵنەکەین بۆ باران
من زۆرم ڕق لە چەترێکە
لەگەڵ بارانا شەڕ بکا
چی جوانترە لە دڵۆپێ
باسی ماچێکی تەڕ بکا.

## تەکسی

ئەو ڕۆژانەی هاتووم بۆ لات
هەر گیز تەکسیم نەگرتووە
خۆ هەرگیز لەبەر ئەوەنا
پارەم بۆ بگەڕێتەوە
هەمیشە وام هەست کردووە
ڕێگاکەم کورت ئەبێتەوە

کە لەلاشت ئەڕۆمەوەو
بەتەنیایی شۆڕ ئەبمەوە بەرەو ماڵ
ئەم خەیاڵی ناسک دێت و
ئەمداتە دەستی ئەو خەیاڵ
هەوێنی ئەو خەیاڵانە
هەموو ئەوین ومناڵین
درۆئەکەم ئەگەر بڵێم
ساتێ لە شێوەی تۆ خاڵین .

## تابلۆ کاڵەکان

بریا هەرگیز چاوشارکێمان نەکردایە
پەشیمانم لەو ساتانەی
ئەچووم خۆم لێتئەشاردەوە
چەند جار خۆم لیٚ شاردویتەوە
بمتوانیایە
هەموویم بۆت ئەناردەوە

پەشیمانم لەو نوقوڵە شرینانەی
کە دوور لەتۆ
لەدەمما ئەمتوانەوە
مناڵیم بهاتایەوە هەمووەیم بۆ ئەکڕیتەوە
فرمێسکەکانی جارانیش
بەڕوومەت بۆم ئەسڕیتەوە

بە مناڵی
نیگاو حەزو خۆشەویستیم نەئەناسی
دەنا تەنیا بزەیەکم نەئەبەخشی بەو دار تووەی
جۆلانەم پیا هەڵئەواسی
بە منالی خۆشەویستی یاری نەبوو
نەماڵە باجێنەو جۆجۆ
هیچ کامیان دلاری نەبوو
دەنا هەلوروبەلورم نەئەبژارد
بەدەست وقاچ
لەگەڵ تۆدا ئەم کرد بە ماچ

بمزانیایە لە بری دارا ودوو دار و

زەینەب و تەخشان وپەخشان

لە هەموو دەفتەرەکانما

وێنەی سیمای تۆم ئەنەخشان

پەشیمانم

بمزانیایە گەورەبوون هێندە دڵ ڕەقە

هەر نەمئەویست

بمزانیایە

بە منداڵی نامەمان ئەگۆڕیەوەو

بە منداڵیش تۆم خۆشئەویست.

# بووکە شوشە

لە بیرمدێ کە منالڵ بووم
بووکە شوشەیەکەم هەبوو
ئێجگار ئێجگارخۆشم ئەویست
دایکم زۆر جار
ئەچوو لێی ئەشاردمەوە
من ئەگریام وهەر ئەمویست

ئێستاش کاتێ تۆ ئەبینم

خۆم وەکوو کاتی منداڵی و

تۆش وەکوو بووکە شوشەکەی زووم ئەبینم

ئێستاش ڕۆژێ تۆ نەبینم

بۆت ئەگریم هەر چەند گەورەم

کێ ئەڵێ تۆش

هەر بووکە شووشەکەم نەبووی

لەگەڵ منا وا گەورە بووی ؟

## بەڵێن

من ناتوانم هەر گیز کاتێ دیاری بکەم
بۆ هاتنم
وەکو شیعر لە ناکاوە
هاتنم ونەهاتنم
پێم ناخۆشە کە پێم ئەڵێی
بێ بەڵێنێکی وەکو تۆ
نەبینیومەو نەبەخەیاڵما هاتووە
زۆر ئێواران من بالأم ئەبێ بەشیعر
ئاخر شیعرکەی لەسەر بەڵێن هاتووە

زۆر جار ئەڵێم
خۆزگایە ئەوەندەی شیعر
تۆ منت خۆش بویستایە
هەر کاتێ بیرت کردبام
جێژوانت نەویستایە

# شەراب

بریا منیش
شەرابم خۆشبویستایە
بەس نیە تۆ گریانت بێ
دێ بەهاناتەوە پێکێ
ئەی کە من خەم یەخەم ئەگرێ
باوش بگرمەوە بۆ کێ ؟

# شیرینی

لێم ببوورە خۆشەویستم
بۆ ماوەیەک ڕێگەت پێنادەم بمبینی
دوێنێ دکتۆرێ پێی ووتم
خۆت دوور بگرە لە شیرینی.

# چەتر

خۆشەویستم ، کە جێتهێشتم
لە چەترەکەم چووم بەشکا
چونکە ئەویش وەکو چاوم
دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکی لێ ئەتکا.

# گەڵا

ئەو دارستانە ئاشنای هەموو بەڵێنەکانت بوو
چونکە کاتێ
پیتەکانی ناوەکەتم لەسەر قەدی درەختێکی هەڵئەکەنی
هەر گەڵابوو لای خۆیەوە
بەفاقا پێم پێئەکەنی.

## دڵیان نایە

زۆر ئێواران بە خەندەوە وشەکانم ئەکەونە ڕێ
تاوەکو لە ژوورەکەتا
شەوێ ژوانێ پێک بێنن
بەڵام کاتێ کە دێنە ژوور سەرینەکەت
لە باوەشی سروەری خەوای
دڵیان نایە هەڵتسێنن

## پەنجەرە

ئەگەر شەوێک بیرت کردم
پەنجەرەکانت دامەخە
لە ناو دێڕی نامەیەکا چاو لێکبنێ
جێ ڕامەخە
زۆر شەوانە کە سەرماتە
دێمە لات و
نوێنێ ئەیەم بەسەرتدا
بەهێمنی ماچت ئەکەم
ئەڵێم نەکا خەو بەرتدا

## کلینیک

من ئەوەندە تۆم خۆشئەوێ
زۆر زیاترە لە پەرۆشی
ناشچمە هیچ کلینیکێ
دڵنیاشم خۆشەویستیت
تیاما بووە بە نەخۆشی

# ڕەنگ

ئێجگار سەیرە

خۆشەویستی چەند مەودا کورت ئەکاتەوە

ئەو هەموو دوورییەی هەیە

نەیتوانیوە ڕەنگی چاوت

لەبەر چاوم کاڵکاتەوە

# نامەیەکی کاڵ

تۆ کە دەریایەک ئازارو خەم وناسۆریت پێ چێشتم
بۆ لە نامەیەکی کاڵا ، لێوەکانت بۆ جێهێشتم
بەسەر شێوەی وشەکانتا هێندە فرمێسکم ڕشتووە
نامەکەت کاڵ بووەتەوە
ئێستا بە ماچی کاغەزێ سەبووریم دێ
سەیرکە چۆن دڵم مناڵ بووەتەوە.

## بەسەرچوو

بەسەرچوو وەرزی سوروسات
ئیتر نەتۆ وەرە بۆ لام
نەمن شەوانە دێم بۆ لات
تۆ بووی ناخی منت پڕ کرد
لە گریەو خەم وکەساسی
بەر لەوەی کە تۆ بناسم
من کەی گریانم ئەناسی
ئەمشەو تەمەن لە چاوانما
دڵۆپ دڵۆپ ئەتوێتەوە
ئەو ڕۆژانەی کە گریاوم،هەمووم لە تۆ ئەوێتەوە

# خۆزگە

هەر چەند ئەکەم دڵنیایە
ئەو خەمانەی لەدڵمدان
بۆتی بکەم بە چەند دێڕێ
ئەترسم یادگاریەک
شێوەنێکت پێ بگێڕێ

دڵم نایە گریانی پێ بناسێنم
دڵێکی هەمیشە لە نێو قاقاو بەزم وشادیا ون
هەموو ئارامییەک بۆ تۆ
چی گریانیش هەیە بۆ من
توخوا چۆنن ئەو ڕۆژانەی
کە پڕ بوون لە خۆزگەو بریا
سڵاو بکە لەو ساتانەی
کە چاوی توش لەگەڵ چاوی من ئەگریا

# پۆل

کە لە پۆلا دائەنیشم
خەیاڵەکان تێکەڵ ئەبن لەگەڵ دڵۆپەی ئەسرینم
لە چاوی مامۆستاکەشما بڕوابکە تۆ ئەبینم
من هەمیشە لە ناو گوێما
دەنگ ئەداتەوە دەنگی تۆ
پرسیم لە مامۆستای فیزیاش
نەیزانی بۆ.

## حونجە

ویستم بڵێم خۆشم ئەوێی
ئەوەندە منداڵ بوومەوە
کە خۆمم بینی ڕووبەڕووت ڕاوەستاوم
وامزانی تۆ مامۆستایت و بۆ حونجە کردن هەستاوم.

## پێڵوو

کاتێ سەیری چاوم ئەکەیت
ئەزانی بۆ من پێڵووەکانم دائەخەم
بۆ نیگا پیرۆزەکانت لەسەر چاوم جێ ڕائەخەم

## چاوی تۆ

بە جۆرێک خۆشەویستی تۆ
ئێستە ئالوودەی من بووە
چاوم لە ناو چاوی تۆدا لێ ونبووە
بۆ پێم ئەڵێی لە بیرمکە
هەناسەکەم چۆن ئەتوانم
کە من چاوم ونکردووە و
بە چاوی تۆ ئێستە بۆ دنیا ئەڕوانم

## لە بری تۆ

زۆر شەوانە
کاتێ لەگەڵ دەفتەرەکەم دائەنیشم
من زووتر خەو ئەمباتەوە
بۆ بەیانی کە هەڵئەسم
سەیر ئەکەم لەو ساتەوەی پێڵوی چاوانم نیشتووە
تا بەیانی دەفتەرەکەم
لە بری تۆ لە ژوور سەرم دانیشتووە

## دارڕشتن

یادی شێوەت لە دوا کورسی پۆلەکەما
لەگەڵ سروەی خەیاڵێکا کەوتە سەما
پۆلەکەمان بوو بەخەندەو بە پێکەنینەوە هاتی
دارڕشتنی بەهارمان بوو باسی تۆم نوسی لە باتی

# ماڵە باجێنە

زۆر جار بەڵێن بە خۆم ئەدەم
خەیاڵی خۆشەویستی تۆ لە دڵما لێک نەیەمەوە
کەچی وەک ماڵە باجێنە
بڕیارەکەم دوای ساتێ تێک ئەیەمەوە.

## سروشت

هۆنراوەی من
زۆر دیمەنی جوانی سروشت مەستی ئەکا
بەڵام هەرگیز هیچ دیمەنێک نایهەژێنێ
وەک دیمەنی ئەو جۆگەلەی
کە ئێواران خەمی دووریت
لە چاوما دروستی ئەکا

## وێستگە

دڵم پێسە  لەم وێستگەیە
ئەڵێی لەسەر تۆ وەستاوە
هەزارەها کەس تێپەڕین
ئەم هەر لە جێگەی خۆی ماوە

# مۆم

یەکەمین کەسێت هەستەکەم

هەمان وێنەی دڵی خۆمێت

بەڵام هێشتا دڵنیانیم

ئاخۆ کچی یاخود مۆمێت

لەسەر هەزارەها پەڕە

نوسیومە من تۆم خۆشئەوێ

بەڵام دەستە نەرمەکانت

جوانترین پەڕەی نامە بوون

ئێستا ئەڵێم ئەو پەڕانە

خۆزگە هەمیشە لام ئەبوون

# خۆر

ئەم بەیانیە خۆر مات بوو
بەر گێکی کاڵی تەماوی لەبەرابوو
ورد ورد شاعیرانە ئەهات
کاسکێتێکی هەورینیشی لەسەرا بوو
سەیر بوو لام ، هەواڵێکی تۆی نەپرسی
لەوە ئەچوو پێی زانیبێ
ئەمشەو دوا نامەم بۆت نووسی

## بەئەسپایی

کاتێ نامەت بۆ ئەنووسم
بەئەسپایی پێنوسەکەم بەسەر پەڕەکەدا دێنم
دڵی تۆ یەکجار ناسکە
زۆر ئەترسم بیڕوشێنم
تا ئێستا هیچ جێگایەکم
بە شوێنتا نە پشکنیوە
بەڵام شوێنێکیش شک نابەم
بڵێم تۆم تیا نەبینیوە

ئیتر گوڵم چۆن سوپاسی شیعر ناکەم
ئەگەر شاعیر نەبومایە
نەمئەتوانی بۆت بنوسم
هەرگیز هەست بەدوریت ناکەم

## جانتا

خۆشەویستم...
هەموو شەوێ نامەکەی تۆ
لەناو جانتاکەم دەرئەکەم
وەک منالێکی بچکۆلەی سەرەتایی
ووشەکانی لەبەر ئەکەم
کە منالْ بووم مامۆستاکەم
بۆ یەکەمجار
نووسینی دارای فێرکردم
کە گەورە بووم
پیتەکانی ناوەکەی تۆ ، هەردوو دەستیان داگیر کردم

## پەنجەرە

دوێنێ ووتم بە یەکجاری
ئیتر لە دڵمت دەرئەکەم
بەڵام ئەمشەو
شێوەت بوو بە نەخشێکی کاڵ
لەسەر پەردەی پەنجەرەکەم
چوومە نزیکی پەردەکەو
تێر سەیری چاوەکانتم کرد
گلەیی بێ
بۆ چی لەبەر چاوم وون بوی
کە لێوم بۆ ڕوومەتت برد ؟

## پیاسە

کە ئێواران
بە پیاسە لەگەڵم دێیت و
بە هێمنی دەستم ئەگریت
ئەو شەقامە فراوانە
لام ئەبێ بە دێڕێ شیعرو
خەڵکەکانیش کۆمەڵێ پیت

# کاغەز

خۆشەویستم بڕوا بکە
ئەو کاغەزانەی لە لامە
هەتا ئێستاش دڵنیانیم
وێنەی خۆتن یاخود نامە .

## کات

کاتێ کە تۆم نەناسیبوو
زۆر کەم سەیری میلی کات ژمێرم ئەکرد
بە کەمتەرخەم
چر کەکانم بەڕێ ئەکرد
بۆیە ئێستا واهەست ئەکەم
جوانی ژیان ، گرنگی کات
لە جیهانی پڕ لە سۆزی
ئەم خۆشەویستییەوە هات

## باڵندە

گەلێ جار دڵم دەخوازێ
ببێ بە باڵندەیەک و
بە ئاسۆدا بخولێتەوە
بەڵام زۆر نیگەران ئەبم کە نازانم
بۆ چی باران
دایم بە چاوی تەڕەوە لە ئاسمانەوە دێتەوە

## ژیان

کە جەستەی ساردم ئەبینم
لە پەڕەیەکی ژاکاوا
هێندەی تر کەنارگیر ئەبم
بەڵام چی بکەم کە بەیانیان ژیان ئەدا لە دەرگاکەم
نەیکەمەوە ڕوو گیر ئەبم

## دوا نامە

کە دوانامەت گەشتە دەستم گریاندمی
بەر لەوەی بیخوێنمەوەو بزانم لە منت ئەکا
بەبێ ئەوی زانیبێتم
وشەکانی هەوری ڕەشەو لەبەر چاوم ونت ئەکا
بۆت نوسیبووم
لەمە بەدوا هەر یەکەو ڕێگایەک ئەگرین
ئیتر لە یەکتر دوور ئەبین
تا وەک ئەم نامەیە ئەمرین

لەچەند دێڕێکدا نووسیوتە
من لە بیرت بەرەوە
ئیتر بەدەم گریانەوە
بیر لە ڕۆژانی ڕابردوو مەکەرەوە
بۆ بیرت چوو ئەو ئێوارەی
لەسەر سوچی دەفتەرەکەم بۆمت نوسی
سروشت بێ تۆ جوانی نیە
ئەوەی جارێ بۆ خۆشەویستەکەی نەگری
لە هەست و سۆز بێ بەریەو
دڵۆپێ ویژدانی نیە

بۆ بیرت چوو کە پێم ووتی

لەبەر ناوەکەت زەردەشتیم

ئەی خۆت نەتوت

گەر خۆشەویستی ئاین بێ

من یەکەمین کەس بەهەشتیم

بەڵام قەینا

دوا نامەشت هەر بە سنگمەوە ئەنێم

بەڵام ئیتر بۆت ناگریم

پێ بەجەرگی خۆما ئەنێم

## ماچ

دڵم نایە ماچت بکەم
چونکە لێوم
تا بڵێی شەڕانی و شێتە
ئەترسم وەها تێبگەی
ڕقم لێتە .

## فەرهەنگ

بۆ نوسینی هەر نامەیەک
ئاچەپکێ ووشەم چنیوە
دەیان فەرهەنگی ناسکم پشکنیوە
هەر بۆ وشەی جوان ئەگەڕێم
ئەگەر ڕۆژێ لە قوڵایی فەرهەنگێکیشا وون ببم
چۆن دڵم ئەدەم بەدێرێ
تا تەواو دڵخوازی نەبم .

## یاسا

ئەو بەیانیەی جێتهێشتم بڕوام نەکرد
من وام زانی بە گاڵتەوە دڵی خۆتت لێم سەندەوە
بۆیە ئیتر داوام نەکرد
عەیامێکە لێم دووریت و
کەچی من هەر بڕوا ناکەم
هەناسەکەم خۆت ئەزانی
لەگەڵ تەنیایی هەڵناکەم
لەوە زیاتر بیرت بکەم
هاکا شەوێ بەبێ ئەوەی لە دەرگا بەم
بەسەر دیواری ماڵتانا دێمە ژووری
ئەگەر پۆلیسیش بمگری
دڵی یاسا لە دڵی تۆ نەرمترە و لێم ئەبوری .

## گۆرانی

کەشەو دادێ
هەرچی گۆرانی تەنیایە
تا بەیانی
دەستیان لەملی منایە
ئەم شەو درەنگ گۆرانیەک
هێندە گریا دەنگی نووسا
ووتم هەستە هەناسەکەم
هەستە بڕۆ سەر جێگاکەت
بەهەنسکی گریانەوە
ووتی ئەی دڵە تەنیاکەت ؟

من پێم سەیرە
گۆرانیەک بۆ من وایە و
کەچی من لەلای تۆ مردووم
تەزویەکی ئەو ڕۆژانەت لەبیر نییە
کە چەند بەدڵ ماچت کردووم .

# گەڕان

بەم رۆژگارە
من ئەگەڕێم بۆ وشەیەک
بەهێز تر بێ لەشەیدایی
ئەوەی ئەمەوێ پێت بڵێم
بۆم ناوترێ و
ناشمەوێ بۆتی دەربڕم بەسانایی
بەبێ ئومێد خۆشم ئەوێی
دڵنیام وشەیەک نیە
مەگەر پێت بڵێم بۆت ئەمرم
لەمردنیش زۆر ئەترسم
لەبەر ئەوەی کە ناتوانم لە دوای ئەوە دەستت بگرم

بەم ڕۆژگارە بەرامبەر یەک رائەوەستین
بەبێ ئەوەی جارێ ژوانێ ببەستین
من دڵنیام من و تۆ لە کەس ناترسین
بەڵام زمانێ شک نابەین
کە پێک ئەگەین
باس و هەواڵی ئەکتری پێ بپرسین .

## نیشانە

لەو ڕۆژەوەی کە ناسیومیت
دڵم لکاوە پێتەوە
من دڵنیام
وەک نیشانەکەی ڕوومەتت
تامردن لێت نابێتەوە

ڕەنگە ڕۆژێ وەک پەپوولە
بنیشێ بە پرچتەوە
من ئەترسم بیرت بچێ
لەپەرچەمتی بکەیتەوە
لەگەڵ خۆتا
ڕەنگە بیبەیتە پۆلەوە و
بۆ ماڵەوەی ببەیتەوە .

## ناو

من ئەوەندە تۆم خۆش ئەوێ
هەموو رۆژێ
کە لە پۆلا مامۆستاکەت ناوت ئەڵێ
حەز ئەکەم من لەبری تۆ بڵێم بەڵێ .

## شیعرێک

خۆشەویستم ..
لەو ڕۆژەوەی پەنجەم بەر پەنجەت کەوتووە
لەناو لەپما
شیعرێکی ناسک خەوتووە
ئەڵێم ڕەنگە خەو ببینێ
هەرچەند ئەکەم دڵنیایە بیخەمە سەر دەفتەرەکەم
لەبەر ئەوەی چاوی لە چاوی تۆ ئەچێ
ڕۆژی دە جار ماچی ئەکەم .

## ئەوین

کە هاتوومەتەوە بۆ لات
هاتووم بێیتەوە ناو دڵم
شیعرێک ناردوومی بەشوێنتا
دڵنیام کە هەر دێیتەوە
چونکە تێکەڵم لە خوێنتا
هاتووم بێیتەوە چاومەوە
فرمێسکێ منی ناردووە
ئەم چەپکە گوڵەی دەستیشم
ئەوین پێمی سپاردووە .

# ئێوارەیەک

ئێوارەیەکیان پێ ی ووتم
ئەو کاتەی لێم تورە ئەبیت
هیچ ناترسم لەبیر خۆتم ببەیتەوە
بەر لەوەی کە خۆر ئاوابێ
دێیت و ئاشتم ئەکەیتەوە
بەڵام ئەو جارێک تورە بوو
ڕۆیی و ئیتر نەهاتەوە
تەمەن لە ئاوابوونایە و
نایە ئاشتم بکاتەوە .

## ئیمزا

بەڵێن ئەدەم هەتا مردن خۆشمبوێی
بڕواشم وایە تەمەنم
بۆ خۆشەویستی تۆ کەمە
ئەگەر باوەڕم پێناکەی
فەرموو ئەوەش
بەنجە مۆرو ئیمزاکەمە .

# گوارە

بیرتە جاران
گوارەیەکی کریستاڵیت لەگوێ ئەکرد
پێم ئەوتی هەمیشە ئەڵێی سورەییای
ئەم ئێوارە سورەییای ژووری میوانمان کەوتە خوارێ
وا هەستم کرد تۆ بووی شکای
بەدیاریەوە تێر تێر گریام
کەسێ نەبوو چاوم بسڕێ
دڵم نەهات گسکی لێبەم
ئەشمزانی دەستم ئەبڕێ .

# خەو

چەند خەوم پێتەوە دیوە
هەتا ئێستا خەو پەرژێنم نەکردووە
بۆ ئەو رۆژەی کە دێیتەوە
بەفردێلەیەکی ناسک
هەموویم چەپک کردووە

## وانەی پێشوو

وانەی پێشوو
مامۆستای ئینگلیزی ووتی
گەشتینە کوێ ؟
ئادەی هەستە بیخوێنەرەوە بەپێوە
ووتم من گەیشتبوومە بەر دەرگاکەی ماڵی ئەوان
ئیتر نازانم بۆ ئێوە .

## تەمەن

لەدابەشکردنی تەمەندا
ئەترسم خوا یەکسان نەبێت
حەزئەکەم یان وەکو یەک بین
یاخی من لەتۆ کەمتربێت .

## مەسج

ئیتر مەسج مەنێرە بۆم
من شەیدای نامەکانی تۆم
هەرچەند ئەکەم ئەو فۆنتانە
هەست ناکەم لە تۆوە هاتوون
دێڕە خوارو خێچەکانت لام شیرینن
جوان دیارە لەترپانداوە و
بەسەر خۆشی بۆلام هاتوون .

## نەمام

لەبیرتدێ

لەتەنیشتی نەمامێکەوە ڕاوەستاین یەکەم ژوان

ئێستا باڵای بەرزترە لەهەردووکمان

زۆر جار کە بەوێدا ئەڕۆم

توند باوەشی پێدا ئەکەم

لەقوڵایی هەستمەوە ماچی ئەکەم

هەر کەسێ بەوێدا ئەڕوا

ئاوڕم لێ ئەداتەوە

کەس نازانێ لەم شارەدا

تەنیا ئەم درەختە هەیە

سەبوری من بداتەوە .

## دوا باران

لەبیرتدێ
دوا بارانی زستانی پار
کە چووینە ناو تەکسیەکە
چەترەکەم تۆ داتخستەوە
ئەم زستانە کە هەڵم کرد
بارانێ تۆی بیرخستەوە

ووتی لە کوێیە ئەو کچەی
زستانی پار ئێوارانێ
گەلێ گریا بەسەر شانتا
کوا لەکوێیە ئەو چاوانەی
ئەتوانەوە لە چاوانتا
گەلێ جار بەدەم ڕێگاوە
من باسی میهرەبانی تۆم
لەگەڵ ئەو چەترە کردووە
بۆیە ڕووم نەهات پێی بڵێم
تۆ منت لەبیر کردووە

نەمئەزانی باسی چیبکەم

لەتاواندا باسی هەتاوم ئەکرد بۆی

بەڵام ئەو وازی نەهێنا

لەپرسیارە مەستەکەی خۆی

ناچار بووم ووتم باران گیان

بەجێی هێشتم

کاتێ ڕۆیشت بەدەیان شیعری گریانم

توخوا بۆ لەویش ناپرسی

بەڵکو بڵێ پەشیمانم .

## بنوو

تۆ بەم شەوە بۆ کوێ ئەڕۆی
نوستوون هێشتا شەقامەکان
هێشتا لە باوەشی خەوان
چاوی ڕەشی کۆڵانەکان
ئەوەی ئێستا نەنوستووە
من و ئەستێرەین لەگەڵ تۆ
من نازانم ئەبێ ئاخۆ
ئێمە شێت بووبین یاخود تۆ

بنوو بنوو
کچێ بۆ ڕۆیشتن مەگری
من ئەزانم سبەی شەویش
بۆ من ئەگریی
بۆ بیرت چوو سەردەمێ بوو لێت ئەپرسیم
ئەو شەوانەی میوانی تۆم بۆ واکورتن
بنوو ئەمشەویش هەر ئەڕوات
بڵێی هەتاویش وەکو تۆ
سوێندی نەهاتنەوە بخوات .

## فانابوون

هاوڕێ ....
جگەرەیێ داگیرسێنەو
تاوێ بڕوانە ئاوابوون
بڕوانە بۆ ئەو ڕەنگانەی
هەموو پڕن لە فەنابوون
گەردوون لە خەمی مندایە
یاخەمی من لەگەردوونا
نامۆیی لەدڵما ئەژی
یاخود دڵم لەونبوونا

هەناسەی وەڵامێ نیە
هەتا پێناسەی زەمەنکا
تابە نیگای ئومێدەوە
سەیری چاوانی تەمەنکا
تەنیا ئەوەندە ئەزانم
هەموو شتێ هەر ونبوونە
چارەنوسی هەناسەشمان
ئاوابوونە ئاوا بوونە .

## یاد

ویستم نامەت بۆ بنووسم
کە بۆم نوسیت خۆشەویستم
بڕوا بکە لەناخما
بوو بەگریان ئەوەی ویستم
وا نەزانی لەیادم نیت
هەمیشە تۆ لەهەستمای
پیاسەی هەموو ئیوارنیٚ
دەستێکیت و لەدەستمای
لێم ببورە گوڵم گەر چی
تۆ چاوەڕوانی وەڵامیت
نازانم باسی دووری کەم
چونکە هەمیشە لەلامیت .

## ڕاستە هێڵ

کە لەپۆلا دائەنیشم
بەو ڕاستە هێڵانەش ئەگریم
کە لەوانەی بیرکاری دا بەیەک ناگەن
من وا هەستەکەم ئەوانیش
وەک من و تۆ لەیەک ناگەن .

## پەیوەست

من بۆیە هێندە پەیوەستم
بەسیمای وێنەکانتەوە
ڕۆژە جوانەکان جێماون
بەسۆمای چاوەکانتەوە
ئەو ڕۆژانەم دێنەوە یاد
کە دور لە ئاهی دووری بوو
هەر هیچ نەبێ زەردە پەڕێ
لە گۆیژەوە سەبوری بوو

ڕۆژانێ بوو ئاسۆی تەمەن
ئاوا هەورو غوبار نەبوو
کەشتی دڵم هەناسەکەم
ئاوا دوورە کەنار نەبوو
هیچی ترت بۆ نانووسم
لەغەمگینیت زۆر ئەترسم
سڵاوم هەیە بۆ چاوت
هەواڵی لێوت ئەپرسم .

# سلێمانی

سلێمانی بیرت ئەکەم
فرمێسکەکانی ئەمشەوم ...
لەگڵۆپەکانت ئەچن
زۆر ئێواران بیرەوەریەکانی تۆ
وەکوو تەزوویەکی شیرین
بەناو دڵما دێن و دەچن

سلێمانی
ئێستاکە چۆن بیرت نەکەم ؟
چۆن بۆت نەگریم بەکەساسی
کە یەکەمین حەرفی شیعرم
لەدەفتەری سیمای بێ وێنەتا ناسی
سلێمانی بیرت ئەکەم
ئای چەند تینووم بۆ دەلاقەی پەنجەرەیەک
خۆزگە ئێستا شوستە کانتم ئەخوێندەوە
وەکو دێڕی سەر پەڕەیەک

سلێمانی ... توخوا ئێستە
هەر وەکوو جاران ڕوو خۆشی ؟ !
یان تۆش وەکوو سێبەری سەر لاپەڕەکەم
ئێوارەیەکی خامۆشی ؟
سلێمانی ..
هەر نامەیەک بۆ هاوڕێکانم ئەنووسم
بە ناوی تۆ دەستپێ ئەکەم
بڕوا بکە ئەسرینێکم
بەگلێنەتا ڕێئەکەم

لێم ببورە سلێمانی
بەمناڵی لقی گەڵیٚ درەختی تۆم شکاندووە
زۆر پاساری بیٚ گوناهتم گریاندووە
ئەگەر بگەرێمەوە لات
وەکو جاران مناڵ نابم
ئیتر چرۆی هیچ گوڵێکت ناوەرێنم
هەر درەختێکت ببینم
وەکو یەکەم خۆشەویستم
دەستم بە پرچیدا دێنم .

# با

ئێوارەیەک ( با ) پێی ووتم
وەرە با سەماکەین تاوێ
زۆر حەز ئەکەم هەناسەی گەرمی شاعیرێ
خۆی بۆ باوەشم بهاوێ
ووتم چنارێ نەماوە
مستێ لە ڕۆحی من نەبا
بۆ تۆ نابیت بە شاعیرو
منیش ببم بە شنەبا .

## تارا

با ئەڵقەکەت تیشکی دێرە شیعرەکانمی بەر نەکەوێ
من ئەزانم ئەتوێتەوە
با ناوبانگی کورەی دڵی من نەبیستێ
نەبا پەشیمان بێتەوە
با تاراکەت بەنهێنیمان نەزانێ
نەبا ببێ بە نەورەس و بترفێنێ
منیش بە فرمێسکەکانی خۆم وتووە
دەریاکان تێنەگەیێنێ
بڕوام نەبوو تۆ ببی بە بوکی خەم و
ئەم هونراوە گریاوە بێ بە زاوا
بە پەیمانە شکاوەکەی خۆت ئەسپێرم دە ماڵئاوا .

## کابوس

دنیا ئەگری لە دڵمدا و
پەنجەم سڕە تا بنووسێ
خۆشم ویستی و نەمئەزانی
کۆچت ئەبێ بە کابوسێ
مەودای نێوان دوو دڵی شێت
ئێستا بووە بە گریانێ
خۆزگە ئەو کاتەی کە ڕۆشتی
نەتئەهێشت دڵم بزانێ

شەوانە لە سرووەی خەودا
بەگریەی دڵ بەئاگا دێم
منالآنە هاوار ئەکا
تەنیا مەڕۆ لە گەڵت دێم
کە دوا ماچت کردم ویستت
تەنیاییم بڕەوێتەوە
نەتزانی لێوت شیرینە و
لێوم تینوو ئەبێتەوە .

# گەردون

کە تۆ ڕۆشتی
هەوری سپی عەشقی منیش ڕەویەوە
شتێ نەبوو خۆشەویستی پێ ببەخشم
هەتا وشەم دۆزیەوە
کە ئاشنابووم بەجیهانی وشەو شیعر
ئەوسا زانیم ، گەردونێکی تریش هەیە
لەعەشقی کچێ گەورەتر .

## زەمەن

خۆشەویستم
بۆ ئەوە ناگریم جێمدێڵی
لەشەپۆلی زەمەنێکی سەرە ڕۆدا
ئەگریم بۆ ئەو هەست و سۆزەی
مرد لە نێوان من و تۆدا .

## گومان

خۆشەویستم ..
چاوەکانی تۆ هەمیشە گوماناویین
بۆیە منیش ئەو دێڕانەی بۆت ئەنوسم
هەموو پیتەکانی ئاوین .

## پەڕەیەکی سپی

بۆت نوسیبووم
سەیر بوو لام
کە نامەکەتم کردەوە
تەنیا پەڕەیەکی سپی لەناوا بوو
ئەو پەڕەیە سپی نەبوو
شیعرێکی نەنووسراوی لەچاوا بوو .

## ڕۆژ ژمێر

دڵمنایە ئێستا کاتژمێر لەدەستکەم
ڕۆژ ژمێری سەر دیواری ژوورەکەشم داگرتووە
بۆ ئەوەی کە هەر نەزانم چەند ڕۆژ ئەبێت
لێرە سەفەرت کردووە .

## میهرەبانی

من ئەوەندە لەلای شیعر
میهرەبانی چاوەکانتم باس کردووە
ئێستا ڕووم نایە پێی بڵێم
دڵمی وردوو خاش کردووە .

## بێداری

نە شەوان ئەتوانم بنووم
نە لەگەڵ ئەم بێداریەشدا هەڵئەکەم
ئێستا فێربووم لەگەڵ دڵم
ڕۆژی چەند جارێ شەڕ ئەکەم
من حەز ئەکەم لەبیرتکەم
تا ئەو ڕادەی رقم لێت بێ
بەڵام چی لە دڵم بکەم
کە هەمیشە چاوەڕێتبێ .

## کازیوە

ئەگەر کازیوە بوو ڕۆشتی
هێواش هەنگاو هەڵبهێنە
شەقام لەشیرین خەوایە
بۆ خەم بە ئەگای مەهێنە
دوا ئاوڕت مەدەرەوە
با دڵی شار گومان نەکا
ئێوارە زۆر دڵی تەنگ بوو
دەبا دەست بەگریان نەکا
زۆر ئەترسم لەو دیمەنەی
تۆ لەمن ئەسێنێتەوە
مەگەر خەیاڵی میهرەبان تۆ بۆ من بهێنێتەوە .

## هەتاو

ئەو کاتانەی بیرت ئەکەم
پڕ پڕ ئەبم لە گریانێ
بەڵام بێجگە لە تەنیایی
ناهێڵم کەس پێ ی بزانێ
ئێستا رقم لە هەتاوەو
بێزارئەبم بەگشت تینێ
چونکە لە چاوم ونیت و
ئەو ئەتوانێ تۆ ببینێ .

## مەیخانە

ماوەیەکە
کە ئەمەوێ دەستم لەدەستت بێتەوە
خێرا ئەڕۆم لە مەیخانە بڕیار ئەدەم
بۆ ئەوەی هەتا بەیانی زوو لەبیرم بچێتەوە .

## شکان

خۆشەویستم
تۆ منیشت فێر کردووە
زۆر پەیوەست بم بە هەستمەوە
هێندە ناسکی ئەترسم
ڕۆژێ بشکێی بەدەستمەوە .

# دڵم

ئەگەر ئەم جارە بێم بۆلات
هەر وەکوو بووکە شوشەیەک
دڵم ئەخەمە بەر دەستت
کەیفی خۆتە ئەیبنێ ی بەسنگی خۆتەوە
یاخود وردو خاشی ئەکەی
خۆت و هەستت .

## سیما

من نازانم چی بنوسم
وەکو سیمات منالآنە و پاکیزە بن
دڵنیابە نامەکانت
ئیتر دواین ئازیز ئەبن .

## میرات

ئەوەندە ناسک مەنووسەو
هەموو عومرت مەدەرە دەستی یەک بەڵێن
ئەمە یەک لەو رستانەیە
زۆر جار پیاوەکان پێم ئەڵێن
کەی کچێک ئەوە ئەهێنێ
دڵ و چاوو ئەو هەموو هەستەی تۆ بیات
ئەیانەوێ لەمەشیاندا کەمت بەمێ
وەکو میرات .

## تەنیا بەدڵ

خۆشەویستم
ئەم شیعرانەم تەنیا بەدڵ بۆت نوسیوە
پەنجەمیان بەر نەکەوتووە
بۆیە بێ لە خۆشەویستی
وشەیەک دەرنەکەوتووە .

## وون بوون

ئەمشەو ویستم بڕیار بدەم
لەچاوە وونبی و تەنیا بم
بەڵام چۆن ئاسمان نەبینم
کە هەمیشە لە بنیابم .

## هاوین

لەناو وەرزەکانا جاری جاران
تەنیا دڵخوازم بوو هاوین
سەد جار بەڵێنم پێداوە و
پێم ووتووە
من و تۆ دڵخوازی یەکین هەتا ماوین
عاشقێکی زۆر بێ وەفام لێ دەرچووە
لەوەتەی کە تۆم ناسیوە
ئەو هەموو خۆشەویستتەی وەرزی هاوین
لەدڵمدا بەسەر چووە

دایم دەستم بەدووعایە
ئەڵێم خوایە
یاخود ساڵ بکەی بە سێ وەرز
یاخو پەردەی ژیانی من
بەیەک جاری دابەیتەوە
چونکە هاوینان پشوەو
تۆ بۆ زانکۆ نایەیتەوە

ئەم هاوینە چۆن بزانم
ڕۆژانە چی لەبەر ئەکەی
پرچت چۆنە مۆدێلەکەی
وەکو زستان
ئاخۆ کڵاوی ڕەنگاو ڕەنگ لەسەر ئەکەی ؟
چۆن بزانم چی ئەکەنیت
یاخوود پەست و تەنیا و ماتی
لە کام دەفتەرەم بنوسم
ئەمڕۆ چیت لەبەرابووەو
کاتژمێری چەند بوو هاتی .

## ئەلبوم

ئەمشەو ئەوەندە بۆم ڕوانیت
تاتێکەڵ بووی لەگەڵ هەستم
لەنێو ئەلبومە شەیداکەم هاتیتە دەر
هیواش دەستت دایە دەستم
دەرگای ژوورەکەت کردەوە
بۆ قەیسەری بیرەوەری
عەسرانێ منت بردەوە
لەو بازاڕە لەناو هەموو کچەکاندا
بێ وێنە بووی
کاتێ کە هۆشم هاتەوە
ئەلبومەکەم بۆت ئەگریا و
تۆش هەر وەکو خۆت وێنەبووی .

## شەوێ

نامەکانت ئەوەندە شرین و جوانن
تا ماچیانکەم تینوو ترم
ئەترسم نامەم لێ ببڕیت
شەوێ بە بێدەنگ بمرم
هەرچەند ئەکەم دیمەنێکم لەیاد نیە
چۆن تەمەنی ڕابردووم بەسەر بردووە
بڕوا بکە یادەوەریم
تەنیا تۆی وون نەکردووە
هەتا ئەم ساتەی ئەنوسم
لەدڵما بووی لەگشت شوێنێ
ئەو ئێوارەی بەدەم نمەی گریانەوە
ووتت نابێ وونم بکەی
لەیادمە وەکو دوێنێ .

# شێوە

هەفتەیەکە شیعرێکی جوان
دڵمی کردووە بە ژوان
هەرچەند ئەکۆشم ناتوانم
بیخەمە سەر لاپەڕەیەک
چونکە شێوەی لەتۆ ئەچێ
حەزەکەم تاوەکو ئەمرم
هەر لە دڵما بێتوو بچێ .

# لێکدانەوە

شەوانە تاکەی دانیشم
لێکدانەوە لێکبەمەوە
بەخەیاڵی شاعیرانەم
وێنەی گەردوون تێکبەمەوە
بوونم برینێکی قوڵە
بەسەر دڵی ژیانەوە
تەمەن دڵۆپێکی ڕوونە
دێ لەچاوی گریانەوە
بەخۆم ئەڵێم هەناسەکەم
تۆ کەی تاوێ پێئەکەنی
تاکەی نەغمەی ئەم ئاوازە
بەگوێی شەوگارا ئەژەنی

ئاخر گوڵم لەچی هەڵبێم

کە من هەموو ڕێگاکانم

ئەمباتەوە سەر تەنیایی و

سەر مەزاری شیعرەکانم

دە خۆشبەختی جارێ وەرەو

تورەبوونم هێمن کەوە

پڕ بەدنیا هاوار ئەکەم

بەر لە ئاوابوون دەرکەوە

دەرکەوە تا لە سینەما

مستێ دڵی غەمناک ماوە

هەتا ئەویش وەکو شەونم

لەچاوانمەوە نەتکاوە .

## جەخار

جەخار گوڵم باخێ نیە بۆ من وتۆ لەم شارەدا
تاخەونێ بگێرینەوە ، لەهێمنی ئێوارەدا
دڵنیاییەک شکنابەین یاداشێتکی تیا هەڵگرین
دوور لە چاوی زەقی شەقام دەستەکانی یەک بگرین
لەم دەفەرە خولیاو عەشق خەیاڵی یە خەیاڵی یە
لەپی باران بخوێنەوە بەهار خەونێکی خاڵیە

گوڵم مەگری هەنسکی تۆ لەم جەنگەڵە بەکێ ئەگا
کێ لەحوزنی بێ شوماری چاوەکانی تۆ تێ ئەگا
دڵنیابە ئەم ئازارە قەدەر نیە بێ دەنگییە
ئەم هەوارە بێ چرایە بۆیە واشەوە زەنگیە
لەم وڵاتە ڕەنگەکانیش هی ئێمە نین بەشیان کردن
دڵەکان پڕ لەهیوابوون بەکلی شەو ڕەشیان کردن .

# باخچەکەمان

گوڵم هەرگیز وا هەست نەکەی
خۆشەویستی تۆ مردووە
بۆئەوەی شێوەت ببینم
سەرم بە کەعبەی پەمەیی
سەدان خەیاڵ کردووە
باخچەکەمان ئاگاداری
لێکدانەوەی شەوانەمە
هەموو شەوێ دەمەو بەیان
چاوەکانم ئەچنە خەو
گڵۆپی بەر پەنجەرەکەم
شایەتی کوژانەوەمە

ماوەیەکە
تەنیاییەکی هێندە سەیر
خۆی بە منا هەڵواسیوە
هەرچەندە بیر ئەکەمەوە
جگە لە تۆ
وا هەست ئەکەم کەسی ترم نەناسیوە
نەوەکو جاران گەشبینم
نە جاروبارێک سەر ئەدەم
لەدڵە سەوزو جوانەکەی باخی گشتی
هەرچیم هەبوو
تەنیاییەک هاتوو کوشتی .

## قەڵەمی زیایە

سەد جار بەڵێنم دا بەخۆم
کە نەهێڵم تۆ بزانی
بیرت ئەکەم و خەم ئەخۆم
بەلاَم چی لەپەنجەم بکەم
قسە لەدەمیا ناوەستێ
هەر کە دەستی کرد بەنووسین
ئیتر خوا خوامە ڕاوەستێ

سالێکە ئەیشارمەوە
بۆ ئەوەی کە تۆ نەزانی
شەوانە درەنگ بۆت ئەگریم
بەناخێری لە شیعرێکدا درکاندوێتی
دوێنێ تاسام کە ئەو شیعرە
لەناو ڕۆژنامەیەکا دیم
خۆ ناوێرم پێنوسێکی تازەش بکڕم
هەر ڕائەگەم
فرمێسکی وشەی بۆ بسڕم

بە ناچاری ماوەیەکە

پێنوس هەڵناگرم لەگەڵ خۆم

هەر بۆ ئەوەی کە بزانی

هەمیشە چەند بەخەمی تۆم

دایم مامۆستا پێم ئەڵێ

ڕۆژانی تاقیکردنەوەش

یاژاوەژاو دروست ئەکا

یاهەر نایە

ئەبێ لە (دە) کەس بپرسم

پێت نییە قەڵەمی زیایە.

## برژانگ

بە خەیاڵ سەدان وێنەتم بە برژانگی چاو کێشاوە
یەک بە یەک هەڵمواسیون
بەشووشەی پەنجەرەکان و سکەی پەردەو
ئەمدیو ئەو دیووی دەرگاوە
وێنەیەکیان پێئەکەنێت
داماوە لە گۆشەیەکا
ڕۆژی سەد جار تۆ ئەبینم
لە مەودای هەر چرکەیەکا.

## کەمان

واز بهێنە لەو کەمانە
وا لە باوەشی خەوایە
زۆر دەمێکە دەستت لەملی ئەوایە
لەو ڕۆژەوەی ئەو ئاوازە دڵڕفێنەم
لە کەمانەکەت بیستووە
هەرچی ئاوازی دنیایە
لەبەر تۆ خۆشم ویستووە

## ژیان

ئەوەندە ژیانم بەسە
کە دڵنیام
پڕە لە تۆ بیرەوەریم
بەر لەوەی کە تۆ بناسم
نەک پایزان
هەموو وەرزێ هەڵئەوەریم
بڕوابکە بۆن کردن وخوێندنەوەی نامەکانت
بوون بە فەرزم
ئەم وەرزم دێ و
خۆشەویستیت ئەناسێنێ بە ئەو بە ئەو وەرزم

# بینین

کاتێ لەلات گەڕامەوە
ویستم یادگاری دوێنێمان بنوسم
لە نوکەوە پێکەوە چیمان ووتووەو
چۆن تۆم دیبوو
هەرچەندە بیرم کردەوە
لەتاو چاوت
ڕەنگی پۆشاکەکەی بەرتم نەبینیبوو.

## منالّی

بە منالّی نەمئەزانی
بۆ مامۆستاکەمان ئەیووت
هەتا ئەمڕۆش
خاتوو زین ومەم نەمردوون
کە گەورەبووم ئەوسا زانیم
خێری زنەی خۆشەویستی ماچی کردوون

# شەونم

ماوەیەکە ئەوەندە گوێ لە گۆرانی ناسک ئەگرم
بە خەیاڵی ژوانە ئازیزەکانی جارانی تۆ
تەواو ژیانم لێبووە بە سیناریۆ
ئەمشەو درەنگ گۆرانیەک
هەتا بەیان گریانمی
دڵۆپ دڵۆپ لە چاوانی
شعرێکەوە رژانمی

دواتر دڵم کۆکردەوە
لە ناو زەرفی نامەیەکا
ویستم بیدەمە دەستی تۆ
لەماڵەوە بیرم چووبوو
لە تەنیشت ئینجانەیەکا
دەمەو عەسر گەڕامەوە
گەڵاکانی ئینجانەکە
فرمێسک لە ڕوویان نیشتبوو
نمە نمە
بەیانیش نەبوو تا بڵێم
ئەوە دڵۆپەی شەونمە

# یانە

بەیانیان ئەچم بۆ زانكۆ
ریكۆردەرەكەی یانەكە ئەو گۆرانیەی لەسەرە
كە من و تۆ
دێڕ بە دێڕیمان لەبەرە
هەتا ئەمڕۆش
من هەر وەكو جاری جاران
دێڕەكانی لە گەڵیدا ئەڵێمەوە
دایم لەگەڵ مۆسیقاكەی
بۆ ئامێزی تۆ دێمەوە.

لەخەیاڵما
کورسیەکی یانە نیە
لەسەری دانەنیشتبی
رێستێ نیە دەردەدڵی
شیعرم لەلا نەڕشتبی
تۆش لەگەڵ منا ئەخوێنیت
تۆش خوێند کارێکی خەیاڵیت
وا نەزانیت ئێستا لای من
بیرەوەیەکی کاڵیت

خۆم نەبێ کەس تۆ نابینێ

کەس نازانێ

لەپەنای کانی عاشقانا

چەند بەیانی ماچم کردووی

لە پرسگە تۆ نابین

لەبەر ئەوە باجم بۆ دروست نەکردووی

## پرسیارێک

لە سووچێکی پۆلەکەما دانیشتبووم
بیرم لەتۆ ئەکردەوە
لە خەیاڵما ئێوارە بوو
شەقامێکم بۆ لای ماڵتان ئەبردەوە
مامۆستاکەمان ئەزانێ
من خەیاڵی قوڵم کردووە بە پیشە
پرسیارێکی کردوو زانیم
ووتی ڕۆڵە چەند زیرەکی
لەیەک کاتا
تۆ خەیاڵت لەلای ئەوەو
لای منیشە
چەپڵەیەکیان بۆ لێدام و
ووتی فەرموو دابنیشە

## بەتاڵبوونەوە

ئەو شەوانەی کە بە خەو ئەتبینمەوە
لەلای شیعر باسی ناکەم
ئەڵێم نەبا نەیەتەدی و
دور با بەتاڵ ببێتەوە
شیعری من دەمی ناوەستێ
ئاسانە لای بەشارا بڵاوبێتەوە

## دڵێکی جوان

ئێستاش وەکو جاران شێتم
دڵنیاشم کە نایەیت و
کەچی من هەر چاوەڕێتم
وەک زوربەی شێتەکانی تر
حەزم نیە لە وەشاندنی بەردو دار
هیچم پێنیە جگە لە
پێنوسێکی مەست وخومار

بۆیە شێتێکی بێ وەیم
لەو ڕۆژەوەی بە هۆی تۆوە
عەقڵی خۆمم لە دەست داوە
دڵێکی جوان وناسکم
لە شوێنەکەیدا داناوە
من پێم سەیرە بەجێتهێشتووم
ئێخۆ شێتێ
کە بەدڵ بیر بکاتەوە
کەس سڵی لێ ناکاتەوە

# مۆدێل

ماوەیەک بوو لە دوورەوە
لەگەڵ کچەکانی ترا لێم تێکئەچووی
زۆر زۆر ترسام
خێرا چووم بۆ لای دکتۆرو
لە پاش ئەوەی چاوەکانمی پشکنی
حاڵەتەکەم گێڕایەوە
ووتی ڕۆڵە گیان چاوی تۆ
نە کزبووە و نە ئاوی هەیەو
نە خێلە
کچەکانی سلێمانی
زۆربەیان پرچوو پۆشاکیان
یەک مۆدێلە

# پەرەی گریاو

لەبەر ئەوەی ئێستە شیعرت بۆ نانوسم
بیستم گلەییت کردووە لە بەختی خۆت
هەموو شەوێ لاپەڕەیەک دەر ئەهێنم
گریان ئەنوسمەوە بۆت
ئێستاکە بەشی کتێبێ
ڕەنگە پەرەی گریاوی نوسراوم پێبێ
چاپی ناکەم ئەو کتێبە
تا چابخانە پێشئەکەوێ
هەتا لەسەر پەری سپی فرمێسکی چاو دەرئەکەوێ

## بمبووره

من هەمیشە بەخەیاڵ هەر لەگەڵ تۆدام
تەنیا جەستەم لە تۆ دووره
کاتێ کەسێ خەیاڵەکەم لێ تێک ئەدا
لەبەر خۆمەوە پێت ئەڵێم
ئێستە دێمەوە بمبوره.

# ڕۆژێک

ڕۆژێک دڵم ئەنێرم بۆت
تەمێی بکە
با ئەوەندە شەیدات نەبێ
فێری بکە
هێندە خەیاڵی لات نەبێ
ئەگەر زانیت تەمێ نابێ
دڵم بۆ تۆ و
تۆش دڵی خۆت بنێرە بۆم
تابزانم درۆ ناکەی
دڵی تۆش نەبووە بە مۆم

## چیرۆک

ماوەیەک وا خۆم ڕاهێنا
خۆشەویستیم بۆ دڵی تۆ ئاسایی بێ
زۆر چیرۆکی ڕۆمانسی ئەخوێنمەوە
من ئەترسام
لەڕاستیدا وانەبم و لاسایی بێت
کەچی ئەمڕۆ
کاتێ هاتنەوە یادم جێژوانەکانی جاران
چیرۆکێ بەدەستمەوە بوو
نم نم دەستی کرد بەگریان

## جوانترین داگیرکەر

هەموو ڕۆژێ چاوم ئەکەم
بە جوانترین زەرفی نامە
بۆ خۆشەویستی ئەو کچەی
کە هەمیشە دڵی لامە
ئەگەر ڕۆژێ چەند دێڕێکت بۆ نەنوسم
وا هەست ئەکەم پەنجەکانم وون کردووە
ئەی ناسکترین داگیر کەر
سەیرکە چۆن
تۆ منت داگیر کردووە

## ئیمزا

ئێستا ناسکترین خەمم
بەتەنیا خەیاڵی تۆیە
بڕوابکە لە هەر کوێ بم
تازە دڵمماڵی تۆیە
بە چاوی حەبیبەو نالی
تۆ ناسکترین گوڵی لام
ئەبێ تاڵێ لە پرچی تۆ
لەمەو دوا بکەم بە ئیمزام

## تکا

ئەمشەو تکام لە چاوم کرد
ئیتر هێندە بۆت نەڕوانێ
دڵیشم رازی کردووە
شەوان نەگری ونەڵێ کوانێ
ئەمەوێ شیعریش نەنوسم
وا بەنیازم سبەی شەویش
پەنجەکانم لەسەر ئەوە ڕابهێنم
تەواو گومانیشم هەیە
دوای ئەم بڕیارە بمێنم

## دوعا

هێندەی گەردون بیرت ئەکەم
تاکەی چاوم چاوەڕێت بێ
دایم دەستم بە دوعایە
خواش وەک دڵم ئاگای لێت بێ

## سەری ساڵ

کە کارتەکەی سەری ساڵت دایە دەستم
وا هەستم کرد
دڵم بەیەکەم دەرچووە
سوپاس بۆ خۆشەویستی تۆ
تەمەنم لە کیس نەچووە
ئەمشەو دوو مۆمم داگیرسان
مۆمێ بۆ تۆو
مۆمێ بۆ خۆم
دڵم هەمیشە ئەسوتێ
بۆیە پێم نەوتی سێ مۆمم

## هەنسک

ئەو ئێوارەیەی ڕۆشتیت و
بەهەنسکی گریانەوە
ماچت کردم
هەستم کرد لە دڵتا مردم

## گریمان

کە جارو بار بیرێک لەوە ئەکەمەوە
رقم لێت بێ
هەموو ژیان لەبەر چاوانم ڕەش ئەبێ
واگریمان خۆم ئەتوانم
ئەی دەفتەرە ناسکەکەم
ئاخر ئەویش لە شیعری جوان بێ بەش ئەبێ

## دوورترین هەسارەی گەردوون

تاتۆم هەبێ
من چیم داوە لە بەرزایی و بای باکورو
مەزاجی تۆ بۆگرافیا
رونکردنەوەی مامۆستاو
پرسیاری وشکی جوگرافیا
من بە خەیاڵ پێئەکەنیم لەگەڵ تۆدا
کە مامۆستاکەم پێی زانی
ووتی ئاهەستە ئەفەنی

بزانم بۆ پێئەکەنی

چاوی بڕیبوە چاوم

تادەهات ڕەنگی سورەبوو

لەسەر ئەوەی پێم نەوت بۆ پێئەکەنم

لێم توڕەبوو

ووتی من هەر چیەک بڵێم

لەگەڵ تۆی بێ مێشک کەمە

دورترین هەسارەی گەردون

هەستە پێم بڵێ کامەیە

ووتم خۆشەویستەکەمە

## کوپ

لە دوورەوە سەیرم کردیت
کاتێ کە چاکەت خواردەوە و
چویتە دەرەوەی یانەکە
کوپی چاکەت
هێواش دەستی لەسەر کەلەکەی دانابوو
بە گەردونێ خەیاڵەوە
ئەوەندە جوان وناسک بوو
حەزم ئەکرد لەگەڵ خۆما بیبەمەوە بۆ ماڵەوە.

من هەر قۆڵێکیم ئەبینی
هەستام سەیری ئەودیوم کرد
قۆڵەکەی تری نەمابوو
دواتر ڕوانیمە دەستی تۆ
یاخود مستیلەکەی پەنجەت قاوەیی بوو
یاخود دەسکی کوپەکە بوو
خۆی لە پەنجەت گرێ دابوو

## ڕۆژنامە

گەر بتوانم هەموو ڕۆژێ
شیعرێکم بدەمە دەستت
بروا بکە هەتا مابم
مەجبوری ڕۆژنامە نابم

لێم ببورە خۆشەویستم
بۆ ماوەیەک ...
ڕێگەت پێ نادەم بمبینی
دوێنێ دکتۆرێک پێی وتم
خۆت دوور بگرە لە شیرینی

[illegible]

20-12-2008







دیزاین: بازیان جەلال

نرخی (٥٠٠٠) دینار
چاپخانەی هێرۆ